


# هونەری هەمیشە لەسەر هەقبوون


- ناوی نووسەر: ئارسەر شۆپنهاوەر
- وەرگێڕان: مەحموود هۆمەر باوزی
- هەڵەبڕی: خالید فاتحی
- پیتچنین: رزگار محەممەد حەسەن
- نەخشەسازی: محمد حسێن خەتی
- بڵاوکراوەی: ناوەندی فێربوون
- زنجیرە: ( ٩٦ )
- نۆرەی چاپ: یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠٢٠
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی لاپەڕە:١١٢
- ژمارەی وشە:١٣,٢٧٠
- نرخ: ( ٣٠٠٠)

# هونەری هەمیشە لەسەر هەقبوون

## ٣٨ ڕێگە بۆ سەرکەوتن بەسەر دژبەردا

**ئارسەر شۆپنهاوەر**

وەرگێڕانی

**مەحموود هۆمەر باوزی**

**چاپی یەکەم**

**٢٠٢٠**

# ناوەڕۆك

## کورتەی ژیاننامە

ئارسەر شۆپنهاوەر (Arthur schopenhauer) لە ٢٢ی شوباتی ساڵی ١٧٨٨ لە شاری گدانسک (دانتسیک) لە دایک بووە، باوکی بازرگانێکی کارامەو کارزان و لە ژێر کاریگەری ئەندێشەی ڤۆڵتێردا دژایەتی حکوومەتی سەربازی پرۆسی دەکرد، دایکی شۆپنهاوەر نووسەرێکی دیار و ناسراو بوو.

دوای داگیرکردنی دانتسیک و لکاندنی بە خاکی پرۆسەوە خێزانی شۆپنهاوەر بەرەو شاری هامبۆرگ کۆچیان کرد، لەوکاتەوەش بیرۆکەی ڕاهێنانی شۆپنهاوەر وەک بازرگانێک بوو بە کەڵکەڵەی باوکی، بۆیە ماوەیەک وەک بەردەستی باوکی لە بازرگانیدا کاریکرد، بەڵام بەردەوام لەو کارەی بێزار بوو، ئەو حەزی لە فەلسەفە و ئەدەبیات دەکرد.

دوای ئەوەی باوکی لە باڵەخانەیەکی بەرزەوە خۆی فڕێدایە خوارەوە و مرد، ناچار لە شاری وایمار گەڕایەوە لای دایکی. ئەو سەردەمە بوو کە سوپای فەرەنسا بە فەرماندەیی سەرکردەیەکی لێهاتوو بەناوی ناپلیۆن پۆناپارت سوپا هاوپەیمانەکەی (پرووس-زاکسن)ی تێکشکاند و ئەو سەرکەوتنەی ناپلیۆن لاپەڕەیەکی نوێی لە مێژووی ئەورووپا هەڵدایەوە. شۆپنهاوەر لەگەڵ دایکیشی نێوانی خۆش نەبوو، چونکە ئەو ژنێکی کراوە و ڕۆشنبیرو ناسراو بوو،

بەردەوام لە پای نووسین و هەڵوێستە توند و نەتەوە پەرستییەکانی سەرزەنشتی کوڕەکەی دەکرد.

ئەو کاتەی کە لە هامبۆرگ بوو کەوتبووە ژێر کاریگەری ڕۆمانتیستەکانی وەک نوالیس، شلگل و هوفمان... لەڕێی شلگلەوە ئاشنای فەلسەفەی هیندی بوو، زۆر کاریتێکرد، لە نێو کۆڕە ئەدەبییە دۆستانەکانی دایکیدا لەشاری وایمار (گوتە) ی شاعیری ناوداری ئەڵمانی ناسی. لە ساڵی ١٨٠٩ بۆ خوێندنی باڵا ڕووی کردە، گوتینگن، بۆیەکەمینجار لەوێ لەگەڵ ئەندێشەکانی کانت ئاشنابوو.

دوو ساڵ دواتر بۆ خوێندنی فەلسەفە و زانستە سروشتییەکان چووە زانکۆی بەرلین و لە محازەرەکانی فیشتەدا بەشداری کرد بەڵام زوو ئەوێی بەجێهێشت، لە ساڵی ١٨١٩ وەک مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی بەرلین دامەزرا.

شۆپنهاوەر کە زۆر دژایەتی (هیگل)ی دەکرد، محازەرەکانی خۆی هاوکاتی محازەرەکانی ئەوکردن، بەڵام قوتابیان بەشێوەیەکی ئەوتۆ ڕوویان لە محازەرەکانی نەدەکرد، بۆیە ناچار بوو دوای دوو تێرم واز لە وانە گووتنەوە بێنێت.

دایکی شۆپنهاوەر نووسیویەتی نازانم دونیا و خەڵکی دونیا چیان لە کوڕی من کردووە، کە ئەو بەوئەندازەیە ڕقی لێیانە و دەیانبوغزێنێ؟

شۆپنهاوەر بەهۆی ئەو ڕوانگە بەدبینانەی کە بۆ دنیا و خەڵکی دنیا هەیبوو، لە مێژووی ئەندێشەدا، لەو بیرمەند و فەیلەسوفانەیە

کە بە فەیلەسوفانی ڕەش ناودێرکراون، جیهان لە ڕوانگەی ئەوەوە دۆزەخ و مرۆڤیش بوونەوەرێکی شوومە، زۆر بەدەگمەن لە ژیانیدا متمانەی بەکەسێک کردووە، وەک دەگێڕنەوە بەردەوام لە ژووری خەوتنەکەی چەکی لەژێر سەر بووە، هەرگیز نەدەچووە بۆ لای سەرتاش و ترسی ئەوەی هەبوو کە سەرتاشەکە بە گوێزان ملی لێبکاتەوە، جارێک ژنێکی بەرگدرووی دراوسێی، کە زۆر هاوار و قیژەی کردبوو، بەوهۆیەوە شۆپنهاوەر تووڕە ببوو، بەشێوەیەک بەسەریدا گوراندبوو، کە ژنەی چارەڕەش لە ترسانی لە قادرمەکانەوە کەوتبووە خوارەوە و بەدرێژایی تەمەنی کەمئەندام بوو، دوای ئەوەی ژنە لە دادگا سکاڵا دەکا، دادگا بڕیار دەدات تا ئەو ژنە لەژیاندا بێت، دەبێ شۆپنهاوەر خەرجی بکێشێ.

بەردەوام کێشەی لەگەڵ دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی هەبوو، بەوە تۆمەتباری دەکردن کە بەئەندازەی پێویست هەوڵی بڵاوکردنەوەیان نادەن. زۆر بە دەگمەن هاوڕێی هەبوو، ساڵانی کۆتایی تەمەنی لەگەڵ سەگەکەی لە ژوورێکدا دەژیا، ئەو کێشەی لەگەڵ فەیلەسوفانی هاوسەردەمی خۆی هەبوو (هیگل)ی بەکەسێکی قۆڵبڕ و بەرژەوەند خواز و ڕوودار دەزانی، سەبارەت بە فیشتەش گوتبووی کاری ئەو سۆفیگەری و جادوویە و فڕی بەسەر فەلسەفەوە نییە. ئەو دەیگووت، ئەو فەیلەسوفانە لە پێناو پارە و ئایندا کەڵک لە فەلسەفە وەردەگرن و عەشقیان بۆی نییە، ئەو قەسانەی ئەوان دەیکەن دەتوانین بچین لە شێتەکانی شێتخانە بیانبیستین.

شـایانی باسـە ئەو ڕاوێـژی بە پارێزەرێـک کردبـوو، تـا تێبگـا لەبەرانبەر تۆمەت هەڵبەسـتن و پەلامـاردانی خەڵکـی تـا چەنـد ڕێـگە پێدراوە و لە چ سنورێک تێپەڕی تووشی سزای یاسـایی دەبـێ، بەڵام هەمیشە ڕێزی لە کانت دەگرت و خۆی بە میراتگری ڕاستەقینەی ئەو دەزانی.

لەسـاڵی ١٨٣١ لە ترسـی نەخۆشـی کۆلێرا، لە بەرلیـنەوە بەرەو فرانکفـۆرد هەڵات، لەوێ هـیچ چـالاکییەکی ئەکـادیمی نەنوانـد و بەو پارەیەی کە بە میرات بۆی مابۆوە ژیانێکی مامناوەنـدی بەڕێکـرد، لە ڕۆژی ٢١ی سێپتەمبەری ١٨٦٠ لە فرانکفۆرد مـاڵاوایی لە ژیـان کـرد، لە ژوورەکەیدا جگە لە کتێـب و نووسـینەکانی دوو پەیـکەری برۆنـزی کانت و بوودا هەبوو.

# پێشەکی

ئایا مەبەستی شۆپنهاوەر لە دانانی ناونیشانی «هونەری هەمیشە لەسەرهەقبوون» هونەری فێرکردنی توانج و پلارە؟ ئەم تیۆرییە ڕاسپاردە و ڕێنماییەکی زانستی بەئازارە سەبارەت بە چۆنییەتی سەرکەوتن بەسەر دژبەردا، هونەری مشتومڕو پێکهەڵشاخان دەردەخات، ڕاسپاردەگەلێک کە بەبێ چەند و چوون ماکیافیلیاییە.

بە گوتەی شۆپنهاوەر مشتومڕی مناقەشە ئامێز بریتییە لە «هونەری گفتوگۆ بەشێوەیەک کە کەسەکە بەدەر لە ڕاستی یان ناڕاستی کێشەکەی، پاشەکشە و تەنازولی لێنەکات».

شۆپنهاوەر لەم نامیلکەیەدا بە ئەنقەست یان بە مەبەستی توانج و پلار، بەڵام بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش لاسایی سۆفستایی»یەکانی یۆنانی دێرین دەکاتەوە.

هەروەک دەزانین سوقرات و ئەفلاتوون دیدێکی نەرێنییان سەبارەت بە سۆفستاییەکان هەبوو ئەوانەیان بە کەسانێک دەزانین کە لەبەرانبەر وەرگرتنی مستێ دراو و پارەدا پشتیان لە هەقیقەت و ڕاستی دەکرد و خەڵکیان فێری ئەوە دەکرد کە چۆن هەموو ڕاستییەکان وەک ناڕاست و ناڕاستەکان وەک ڕاست وەربگرن.

لەبەر ئەوە سوقرات و ئەفلاتوون نەفرەتیان لە سەفسەتە دەکرد.

ئەوان دەیانەویست دەستیان وەخێر و ڕاستی ڕابگا و دوو شتیان لە یەکدی جیا دەکردەوە دیالەکتیک[1]، کە بەڕای ئەوان بریتی بوو لە بەدەستهێنان و هەڵێنجانی دەرەنجامی باش لەمیانی مشتومڕی ڕاستگۆیانە و بەهۆی پرسیار و وەڵامی ناو گفتوگۆکانەوە.

سۆفستاییەکان کەڵکیان لە هونەری وتاربێژی وەک جۆرێک لە هونەری سەرنجڕاکێشانی عاتفی و ڕازیکردنی بیسەر وەردەگرت چونکە تاکە ئامانجییان لە وتاردان برەودان بەخۆو ڕازیکردنی دڵی ئەوانی دیکە بوو، وتارو تێزەکانیان ئەوەندە بێپێز بوون بەکەڵکی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و تەنانەت ڕەخنەگرتن لە ئایدیاکانیش نەدەهاتن.

سۆفستاییەکان دەیانتوانی لەڕێگەی وەگەڕخستن و دەرخستنی تواناو لێهاتووییەکانی خۆیانەوە پارە پەیدا بکەن کە ئەم جۆرە

---

[1] - dialectic: دەستەواژەی دیالەکتیک، کەلە باوترینی وشە فەلسەفییەکانە. لەلایەن فەیلەسووفەکانی هەموو سەردەمەکانەوە بەکارهێندراوە بەڵام بەماناو مەبەستی جیاواز، واتا بەردەوام یەک واتای نەبوو.

دیالەکتیک لای ئەفلاتوون بریتی بوو لە تێڕوانین و ڕەفتاری ڕەمەکی دەروون لەڕێی وەرگرتنی مەعریفەدا.

لەلای ئەرستۆ دیالەکتیک بەشێوەی شتێکی بەدەستهاتوو کە ئەو بەمشتومڕ و مناقەشە دەزانین، بەڵام لەبەشێکی زۆری سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەو دەستەواژەیە تەقریبەن هاوواتای (لۆژیک)بووە.

لەو وەرگێڕانەدا هەوڵدراوە لەو شوێنانەی کە دیالەکتیک هاوواتای مشتومڕە، بەمشتومڕ بینووسم و لەشوێنەکانی دیکەش کە وشەکە ڕاستەوخۆ مەبەست بووە ڕێک بە دیالەکتیک دەینووسم. (و.ف)

زانست و لێهاتووییەی ئەوان لە یۆنانی دێریندا کڕیاری زۆری هەبوون، ئەو شوێنەی کە زمانلووسی و ڕەوانی گوتار و سەرکەوتن لەکاتی گفتوگۆدا جێگەی بەختەوەری و خۆشی تاکەکانی گرتبۆوە، باوەڕەکانی سوقرات و ئەفلاتوون ماهیەتی نائەخلاقی ئەو بۆچوونانەیان دەردەخست، بۆیە ئەم بزووتنەوە و تیۆرەکانیان پەسەند نەدەکرد.

هەمان تێروانینی نەرێنی ئەوانیش بوو کە بەدرێژایی مێژوو بوو بە ناسنامەیان و لە ناساندنی ئەواندا باڵی بەسەر دیدگای خەڵکی جیهاندا کێشا، تێڕوانینێک کە گوتار و هونەرەکانی وتاری ڕازیکردنی ئەوانی تا بە ئەمڕۆش دەگا بەدناو کردووە.

کەواتە دەستەواژەی سەفسەتە کە لەوەسفی هونەری ئەواندا بەکار دەبرێ دەستەواژەیەکی بێزراوە.

سەرەڕای ئەوەش ئەوە ڕێک ئەوشتەیە کە شۆپنهاوەر لە«هونەری هەمیشە لەسەرهەقبوون» دا، بانگەشەی بۆ دەکات و هەوڵی فێرکردنی دەدا.

ئەو دەڵێت: دەبێ لە مشتومڕدا چاوپۆشی لە هەقیقەتی دیار بکەین، یان ڕوونتر بڵێین دەبێ ئەمە بە پێشهاتێکی بەڕێکەوت بزانین، دەبێ تەنیا لەبیری بەرگریکردن لە بیرۆکەی خۆمان و ڕەتکردنەوەی بۆچوونی بەرانبەردا بین.

شۆپنهاوەر وەک فەیلەسوف وەک بیرمەندی بەرپرس و کەسێک کە هاودڵی و مروەت بە بنەمای ئەخلاقی دەزانێ، ئایا دەتوانێ بەراستی ئەو قسە و کردارانەی لێبوەشێتەوە؟

کاتێ دێتە سەرباسی ئەو فرت و فێڵانەی کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لایەنی بەرانبەر باس لە راستی یان ناڕاستی دەکات ئایا هەر بەڕاست دەیەوێ ئێمە لەو فرت و فێڵانەی لەلایەن نەیارە بێ ویژدانەکانمانەوە وەک چەکێک لەدژمان بەکار دێن ئاگادارمان بکاتەوە؟

وەڵامی ئەو پرسیارە تا ئەو ئەندازەیەی کە حەزمان لێیەتی ڕوون و ئاشکرا نییە، لانیکەم تا ئەو شوێنەی کە بۆ سەردەمی نووسینی ئەو بابەتە پەیوەندی بە قەڵەمی شۆپنهاوەرەوە هەیە.

یەکەمین وەرگێڕی ئینگلیزی ئەو نامیلکەیە (بیلی ساندرز[٢]) بەسادەیی پێیوایە کە بەشی (سۆفستایی)«هونەری هەمیشە لەسەرهەقبوون» بە مەبەست هاتۆتە چاپ و بڵاوکردنەوە.

هەرچەندە شۆپنهاوەر کەسێکی ئاڵۆز بوو، ڕەشبینی قووڵ و نائومێدانە باڵی بەسەر ژیانیدا کێشا بوو، هاوکات ئەو گۆشەگیرییەی کە لە زۆربەی کاتەکانی ژیانیدا دووچاری ببوو مەرووم بوونێکی بەئازار و پڕ لە بەرزە دەماغی و نەفس بەرزی تا ئەو ئاستەی کە ئەوی کردە دوژمنی (پرۆفیسۆرەکان).

---

٢- Bailey Saunders

شۆپنهاوەر بەردەوام هێرشی دەکردە سەر مامۆستایانی زانکۆ و پرۆفیسۆرە هاوپیشەکانی ئەمەش تەنیا بەو هۆکارەی کە دەیدیت سەرەڕای کورتبینی و دەبەنگی، لووتبەرز و خۆبەزلزانن.

پەرچەکردارەکانی کە تا رادەیەکی زۆر راستییان تێدابوو، دەربڕینەکانی ئەویان دژوار دەکرد.

لەوانەیە بەو کارەی ویستبێتی چەکێک بداتە دەست خەڵکی دیکە، کە بەهۆیەوە بتوانن ڕووبەڕووی مامۆستایانی زانکۆ ببنەوە و بەسەریاندا سەرکەون.

لەسەر هەمان بنەما شۆپنهاوەر دەڵێ: « لەوانەیە بەشێوەیەکی بەرچاو یەکێکی دیکە هەقی هەبێ، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەندێ جار لەبەرچاوی خەڵکی دیکە و لەڕوانگەی خۆیشیەوە شکەستی هێنابێ» بۆیە واباشە کە بزانین لەوکاتانەدا کە ئێمە لەسەر هەقین گەرچی وادێتە بەرچاو کە کەمترین و لاوازترین بەڵگەی لەسەر هەقبوونمان هەیە بەسەر نەیارەکانماندا سەرکەوین.

بەڵام ئەوە پێویستی بەوەیە کە تەنانەت ئەو کاتەی دڵنیا دەبین ئێمە لەسەرهەقیش نین پێداگری لەسەر مافی خۆمان بکەین و خۆ بەدەستەوە نەدەین.

چۆن دەبێ مرۆڤەکان لەکاتی گفتوگۆ و ڕووبەڕووبوونەوەدا بەشوێن سەرکەوتنەوە بن و گرینگی بە هەق و ڕاستی نەدەن؟ شۆپنهاوەر دەڵێت: «زۆر ئاسانە» ئەوە «پیسی و چەپەڵیی سروشتی مرۆڤە!» ئەوە دەرەنجامی «لووتبەرزی کەسی»یە و

ڕاستییەکەش ئەوەیە کە خەڵکی ئەوەندەی قسە دەکەن ئەوەندە بیر ناکەنەوە، بەڵکو زۆربڵێ و زمانلووسن، ئەوان بەپەلە بابەتێک دیاری دەکەن لەوێ بەدواوە بێئەوەی گوێ بەوەبدەن ڕاستە یان ناڕاستە پێیەوە دەلکێن و تەنیا لە پێناو غرور و خۆپەرستیان بەهەموو هێزیانەوە داکۆکی لێدەکەن.

بەو شێوەیە کە لووتبەرزی و خۆپەرستی بەسەر هەق و ڕاستیدا سەردەکەوێ.

سەرەڕای ئەوەش شۆپنهاوەر ئەو شێوەیە درێژە پێدەدا «ئەو فرت و فێڵ و تەفرەدانە، ئەو هەموو پێداگرییە لەمەڕ بابەتێک کە لە ڕوانگەی خۆشمانەوە ڕاست نییە، شتێک دەردەخات!» ئەو جارەیان شۆپنهاوەر تەواو بەڕاستییەتی.

بە باوەڕی ئەو ئێمە هەموومان لەسەرەتادا لەسەر ئەو باوەڕەین کە هەق بەلای ئێمەدایە بەڵام دوایی بەهۆی بەڵگەکانی بەرانبەرەکەمان باوەڕمان لەرزۆک دەبێ و تەنیا لەکاتی دیاریکراودا بۆمان دەردەکەوێ کە ئیتر ئەوەی چوو، چوو! ئێمە لەسەر هەق بووین، لەبەر ئەوە باشتر وایە تەنازوول لە قسەی خۆمان نەکەین..

بە باوەڕی شۆپنهاوەر لەسەر ئەو بنەمایە «سستی عەقڵمان و سەرسەختی و ئیرادەی ئێمە بەشێوەیەکی بەردەوام داکۆکی لەیەکتر دەکەن.»

شۆپنهاوەر دەیگوت لانیکەم لەسەردەمی مۆدێرن شتێکی قابیلی بەراوردکاری لەگەڵ هەڵسوکەوتی شێوە سۆفستایی لە گفتوگۆدا

بوونی نابێ، بەڵام ئەوەی بڵاو نەکردەوە. دوایی لە بەرانبەردا بەشی پێشەکیدا ئەو سەرنجەی بە چاوپێداخشاندنەوەیەکی باشەوە لەبەرگی دووەمی (سەنگوسۆژ و بڕاوە[٣]) دا بڵاو کردوە لە بەرانبەردا بەشی پێشەکییەکە بە ڕستەیەکی یۆناڵ[٤] دەستپێدەکات *vetam impendere vero* «ژیانت بۆ ڕاستی تەرخان بکە» و خۆیشی بەشێوەیەک لە شێوەکان قوربانیی ئەو چارەنووسەیە بەپێتەوەوە هۆشیارانە هەرجۆرە مەبەست و نیازێکی ماکیاڤیلیانە لە بنەڕەتەوە ڕەتدەکاتەوە.

لێرەدا سەبارەت بەو قسەیە دەڵێ: «لەبەر ئەوە نزیکەی چل بەشی لەو فێڵ و گەڕانەی (سەرکەوتن لەکاتی گفتوگۆدا)ی دایهێناون و خستوونییەتیە ڕوو.

بەڵام لە ئێستادا حەزم لە دەرخستنی تەواوی کون و کەلەبەری ئەو هەموو ناتەواوی و کورتبینییانە نییە.

کورتبینی و ناتەواویەکە بە پێداگری لەسەربنەمای فرت و فێڵ و تەفرەدان و تەنگەتاوکردنی خەڵکی وەستاوە».

لێرەدا ئەو لە جیاتی دەرخستنی ڕێنماییەکانی سەبارەت بەچۆنییەتی سەرکەوتن لە گفتوگۆدا فەرمانمان پێدەکا« مناقەشە و مشتومڕ لەگەڵ خەڵکی هەرزە و کاڵفام نەکەین»، گفتوگۆ و

٣- Parerga and parulipomena

٤- juvenal

قسەکردن لەگەڵ خەڵکی کاڵفام و ڕەشۆکی مرۆڤ بەرەو سەفسەتەو بێویژدانی و فریوکاری دەبات.

هەرسێ وشەکە لەلایەن شۆپنهاوەرەوەیە و دەرەنجامیش هەمیشە «مایەی نەفرەتە».

ئەو بابەتە بە تەواوی نیشانی دەدا کە کاتێ شۆپنهاوەر دەگەڕێتەوە سەر ئەسڵی «هونەری لەسەرهەقبوون» ئەوە وەک بەڵگەیەکی گاڵتەجاڕی و توانج ئامێز دەبینێ.

ئاگاداری بەهۆی خستنەڕووی بەڵگە نەک سەرمەشقی ئەخلاق.

بێ پاو و پەردەیی زۆر و خستنەڕووی هەندێ فرت و فێڵ کە ڕوونیان دەکاتەوە ئەوە دەردەخەن کە لە وەحی گاڵتەپێکردن و سووکایەتی پێکردنیاندا بووە.

بەڵام لێرەدا کە ئەم کتێبە بەڵگەیەکی پڕ لە ڕق و کینە بێ و چەپەڵی و خۆپەرستی و سروشتی شەڕانگێزی مرۆڤ بەسەر خۆیدا دەسەپێنێ و بەشێوەیەکی زۆر هونەرمەندانە هونەرەکە دەخاتە ڕوو لە هەمان کاتدا بۆی هەیە هەموویشی توانج و تەشەر نەبێت.
هەرچەندە شۆپنهاوەر نوسخەی ئەسڵی و دەست لێنەدراوی ئەو کتێبەی خستە بازاڕەوە و دوای مردنی بەتەواوی بڵاو کرایەوە، زیاتر ئەو تەوەرە تەمومژاویانەی دەردەخستن کە لە (سەنگوسۆژ و براوە)دا هەیە، بۆیە هیچ کەسێک شۆپنهاوەر بە ماکیاڤیللی تەواو و داهێنەری فرت و فێڵی هونەری ئەهریمەنی نازانێ.

بەڵکو ئەم کتێبە بچووکە، سەیرە وەک نووسینێک و شاکارێکی سەربەخۆی ڕاشکاوانەی توانای لە ڕادەبەدەری ئەو سەیردەکات.

بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بەتایبەتی لە پلەی مشتومڕو شەرەقسەدا، تەبا لەگەڵ تەواوی بۆچوون و دیدگا فەلسەفیەکانی ئەژمار دەکرێ.

**ئەی. سی. گریلینگ**

# «هونەری لەسەرهەقبوون»

هونەری مشتومڕ بریتییە لە هونەری گفتوگۆ بەشێوەیەک کە تاک بەدەر لە ڕاستی یان ناڕاستی بابەتەکە پاشەکشەی لێنەکات°.

لەوانەیە بەشـێوەیەکی ئاشـکرا هەق لای کەسـێک بێـت بەڵام سـەرەڕای ئەوەش لە دیـدی خەڵـکی دیـکەوە زۆرجـار لە ڕوانـگەی خۆشیەوە شکەست بێنێ.

---

° - لەراستیدا، ئەریستۆ دووبابەت لەیەکتر جیادەکاتەوە: (١) لۆژیک وەک تیـۆر یـان شـێوازی گەیشـتن بەدەرەنجـامی راسـت. (٢) مشـتومڕ وەک شـێوازی گەیشـتن بەدەرەنجامگەلێک کە پەسـەند دەردەکەون. دەرەنجامگەلێک کەلەهەمـان کاتـدا راسـت یـان ناراسـت دەردەکەون. ئایا ئەمە هەمـان هـونەری هەمیشەلەسـەهەقبوونە؟ هەنـدێ جاریەبەڵگەی سەلمێنراوەوە و هەندێ جارێش بـێ بەڵـگە. بەواتـایەکی دیـکە هـونەری دەستڕاگەیشتن بەرواڵەتی حەقیقەت، بەدەر لە جەوهەر نییە؟

ئەریسـتۆ هەمـوو دەرەنجامەکـان بەهەمـان شـێواز بە دەرەنجـامی لـۆژیکی و مشتومڕەوە (eristical) دابەش دەکا. (٣) ئەمە شێوازێکە کەدەرەنجام راستە، بەڵام کەرەستەخاوەکەی کەدەرەنجامەکەی لێ هەڵێنجـراوە راسـت نیـین بەڵام راست دێـنە بەرچاو. لەکۆتاییدا سەفسەتە شێوازێکە کەلەوێدا بناغەی دەرەنجامەکە ناراستەو سیما و رواڵەتی دەرەوەی راستە.

ئەم سێ شێوازەی کۆتایی بەمانـای راسـتەقینەی وشـە (هونەری مشـتومڕ و شەڕەقسـە پەیوەستە.»

چونکە حەقیقەتی عەینی لەخۆی دەگرێت و گرینگی بەرواڵەت دەدات بەهیچ شێوەیەک فـڕی بەسـەر راسـتییەوە نیـیە و بەکـورتی تەنیـا بەدوای سـەرکەوتنەوەن جـا بەهەر نرخێک بووە.

بۆ نموونە لەوانەیە من بۆ داکۆکیکردن لە داخوازی خۆم بەڵگەیەک بخەمەڕوو دژبەرەکەشم ئەو بەڵگەیە ڕەت بکاتەوە، بەو پێیە وا دەرکەوێ کە داواکاری منی ڕەتکردۆتەوە.

سەرەڕای ئەوانە لەوانەیە بەڵگەی دیکەش لەگۆڕێبن (کە من دەرکم نەکردوون و نەمزانیون) ڕێک لەوکاتەدا من و دژبەرەکەم جێگۆڕکێ بە شوێنەکانمان دەکەین.

لەو حاڵەتەدا ئەو دەبیاتەوە! سەرەڕای ئەوەی لەسەرهەقیش نییە.

ئەگەر خوێنەر بپرسێ چۆن ئەو شتە بەو شێوەیە دەبێ، لە وەڵامدا دەڵێم ئەوە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پۆخڵەواتی سروشتی مرۆڤەوە هەیە. ئەگەر سروشتی مرۆڤ چەپەڵ نەبوایە و تەواو شەریف بوایە، دەبێ لەهەر گفتوگۆیەکدا تەنیا بەدوای دۆزینەوەی هەقیقەت دا بگەڕێ. نەدەبوو کەمترین گرینگی بەم هەقە بدەین کە بەلای ئێمەدایە یان بەلای دژبەرەکەماندا.

دەبوو ئەو بابەتە بە بێبایەخ، یان لانیکەم بە کەمبایەخ بزانین..

لە دۆخێکی ئاوادا بابەتی سەرەکی ئەوەیە کە لووتبەرزی ئێمە لەبەرانبەر هێزی فکریماندا هەستیاریەکی تایبەتی هەیە، بابەتی سەرەتایی ناڕاست و بابەتی سەرەتایی دژبەرەکەمان ڕاست بووە.

تاکە ڕێگەی دەرباز بوون لەوکۆسپە ئەوەیە کە هەمیشە ئەو زەحمەتە بدەینە بەرخۆمان تا بڕیاری ڕاست و دروست بدەین بەو مەبەستە دەبێ پێش ئەوەی مرۆڤ قسەبکا بیر بکاتەوە.

بەڵام سـەبارەت بە زۆربەی خەڵکـی لـووتبەرزی زاتـی هاوتـایە لەگەڵ چەقاوەسوویی و زۆربڵێی و تەفرەدان.

مرۆڤەکان پێش ئەوەی بیـربکەنەوە قسـە دەکەن تەنانەت ئەگەر دوای ئەوە تێبگـات قسـەیەکی ناڕاسـتی کـردووە، دیسـان پەنـدی لێوەرناگرێت و جارێکی دیـکەش هەمـان هەڵە دەکـاتەوە و دووبـارە دەیانەوەێ ئەو بابەتە بەراوەژوو بخەنە ڕوو.

تـامەزرۆ بـوون بـۆ ڕاسـتی کە لەوانەیە وا لێکبـدرێتەوە تەنیـا بۆچـوونی ئەوان لە دەرخسـتنی ئەو قسـەیەدا بـووە کە گەنگەشـەی ئەوە دەکەن ڕاسـتییە و جـێگەی خـۆی بە بەرژەوەنـدی و قـازانجی فرتوفێڵ دەگرێتەوە.

بەو پێـیە و لەبەرهەمـان فـرت و فێـڵ ئەوەی ڕاسـتە دەبـێ وەک ناڕاست و ئەوەی ناڕاستە وەک ڕاست بخرێتە بەرچاو.

***

بەو حـاڵەتەوە ئەو فریوکـاریی و پێـداگرییە لەسـەر قسـەیەک کە تەنـانەت لە ڕوانـگەی خۆمـانەوە قسـەیەکی ڕاسـت نیـیە، دەرخەری شـتێکە. ئـێمە زۆربەمـان لەسـەرەتادا زۆر بڕوامـان بەقسـەی خۆمـان هەیە بەڵام دوایـی دەردەکەوێ کە دژبەرەکەمـان بەچەنـد بەڵـگەیەک قسەکەی ئێمە ڕەت دەکاتەوە.

ئەگەر یەکسـەر خۆمـان بەدەسـتەوە بـدەین و واز لە بـابەتی قسەکەمان بێنین لەوانەیە لەکۆتادا بۆمان ڕوون بێتەوە کە لە تەواوی ئەو قسە و گفتوگۆیانەدا ئێمە لەسەر هەق بووین ئەو بەڵـگەیەش کە

قبولّمان کرد ناڕاست بوو، بەڵام بەو حاڵەوە بەڵگەیەکی دیکەی ڕاستیش لەگۆڕێ بوو(ئێمە لێی غافڵ بووین) ئەو بەڵگەیەی کە دەیتوانی ببێتە هۆکاری دەرباز بوونمان، بەڵام لەوکاتەدا وەبیرمان نەهاتەوە.

لەبەر ئەوە بەشێوەیەکی ئاسایی هێرش دەبەینە سەر بەڵگەکانی دژبەرەکەمان تەنانەت ئەگەر لە ڕواڵەتدا بەڵگەکانی سەلمێنرا و ڕاستیش بن.

بەو ئاواتەی کە ڕاستییەکی سەرەکی و ڕۆتینییەو لە کاتی گفتوگۆدا بەڵگەیەکی دیکەمان بەخەیاڵدا دێ، کە بەهۆیەوە بەڵگەی دژبەرەکەمان دەکوژێنێتەوە یان لەوە سەرکەوتوو دەبین کە دان بەڕاستی قسەکەماندا دەنێ.

بەو شێوەیە ناچارین ببینە کەسی فریودەر بەهەرحاڵ وەسوەسەی تەفرەدەری زۆر بەهێزە و سستی هۆش و پەتەوی و بەرزی ئیرادەمان بەشێوەیەکی هاوسەنگ بەرگری لەیەکدی دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی هەر لایەنەی گفتوگۆ نەک بۆ دەرخستنی ڕاستی بەڵکو لە پێناو (سەلماندنی ڕاستی) قسەی خۆیدا دەجەنگێ، بەشێوەیەک دەڵێی مردن و ژیان لەم بابەتەدا یەکلا کەرەوەیە.

ئەوە بەدەر لە ڕاستی یان ناڕاستی (قسەی خۆی) بە مشتومڕ دەگۆڕێت.

لە ڕاستیدا هەروەک بینیمان ناتوانێ بە ئاسانی بەپێچەوانەی ئەمەوە هەنگاو هەڵێنێ. کەواتە بە شێوەیەکی سروشتی مرۆڤێ

لەروانگەی دیدگا و باوەڕی خۆیەوە قسەدەکات و داکۆکی و پێداگری لەسەر دەکات، تەنانەت ئەگەر لەهەمان کاتدا قسەکەی خۆی بە ناڕاست یان مایەی گومان بزانێ[٦].

هەرکەس لە ئێمە پشکێکی لە فێڵبازی و شەڕانگێزی پێدەبڕێ و ئەزموونی ڕۆژانەمان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ، هەرکەسەو مشتومڕی سروشتی خۆی هەیە، ڕێک بەهەمان شێوەی کە لۆژیکی سروشتی

---

[٦] - ماکیاڤیلی ئامۆژگاری شازادەکەی دەکات کە بەردەوام هەڵی لاوازبوونی دراوسێیەکەی بقۆزێتەوە و هێرشی بکاتە سەر، ئەگەر ئەوەنەکا لەوانەیە دراوسێیەکەی ئەو کارە بکات. ئەگەر ڕاستی و شەرافەت و پیاوەتی بەسەر جیهاندا حاکم بوایە بابەتەکە جیاوازی هەبوو. بەڵام خۆ ناکرێ لەچاوەڕوانی بینین و دەرکەوتنی ئەو خەسڵەتانەدا دانیشین.
مرۆڤ نابێ ئەو خەسڵەتانە بکاتە خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی. چونکە پاشەرۆژێکی زۆر خراب پێشوازی لێدەکا، لەباسەکەشدا تەقریبەن بەهەمان شێوەیە.
ئەگەر هەرکاتێ زانیم دژبەرەکەم ڕاست دەکا و منیش قسەکەی پەسەند و قبووڵ بکەم ئەگەرێکی زۆر لاواز لەگۆڕێیە کاتێ دۆخەکە پێچەوانە دەبێتەوە ئەویش هەمان کار بکات. چونکە ئەو بەشێوەیەکی هەڵە هەنگاو دەنێ و منیش ناچارم بەهەڵە هەنگاو هەڵێنم.
گوتنی ئەو قسەیە زۆر ئاسانە کە ئێمە دەبێ لەبەرانبەر هەق و ڕاستیدا ملکەچ بکەین، بەڵام گرەنتی ئەوەنییە کە هەق بەلای ئێمەوە بوو دژبەرەکەشمان هەمان کار بکات. بۆیە ناکرێ ئێمەش وابکەین.
لەراستیدا ئەگەر وا بێتە بەرچاو ئەو ڕاست دەکاو هەق بەوە و دەبێ ئەو سەنگەرە بەجێبێڵم کە ئەو هەموو ماوەیە بیرم لێکردۆتەوە و کاتم بۆتەرخان کردووە، لەوانەیە بەهۆی ڕارایی و زاڵبوونی بیری سازش و خۆبەدەستەوەدان لاڕێ ببم و دەست لە ڕاستییەکە هەڵگرم و هەڵەکە قبووڵ بکەم.

خۆی هەیە، بەڵام مشتومڕەکەی بەهیچ شێوەیەک ناگاتە ئاستی لۆژیکەکەی و ڕێنمایەکی دڵنیاکارەوەشی نییە.

هیچ کەسێ ناتوانێ بە ئاسانی پێچەوانەی بنەماکانی لۆژیک بیر بکاتەوە یا بگاتە دەرەنجام (ئەحکامی درۆین زۆرن و دەرەنجامی درۆین دەگمەنن).

ناشێ مرۆڤ بە ئاسانی دووچاری کەمایەسی لۆژیکی سروشتی ببێ، بەڵام دەشێ بە ئاسانی دووچاری کەمایەسی دیالۆگی سروشتی ببێ کە ئەم شتە توانایەکە بەشێوەیەکی نایەکسان بەسەر مرۆڤەکاندا دابەشکراوە، لەو ڕووەوە دیالۆگی سروشتی هاوشێوەی هێزی دیاریکردنە[٧] کە هەرکەسەو بەپێی توانا و لێهاتووی خۆی بەری کەوتووە.

عەقڵ بەمانای وشە هەمان شتە لە بابەتێکدا زیاتر ڕوودەدا کە ڕاستی واقیعی لەلای کەسێکە بەڵام خۆی بە بەڵگەی زۆر لاواز شکەست دێنێ و قسەکەی پوچەڵ دەکرێتەوە.

ئەگەر لە مەیدانی گفتوگۆیەکدا سەرکەوتوو هاتیتەدەر زیاتر ئەو سەرکەوتنە کە قەرزداری بەڵگەی بەهێز و پێز بێ هۆکارەکەی زیرەکی و شێوازی دەربڕین و جۆرێک خستنەڕوویە کە لەبەرگری لەو بابەتەدا بەکارهێنراوە.

وەک تەواوی بوارەکانی دیکە ئەم بوارەش خۆڕسک و بۆماوەییە.

---

[٧]- Faculty of judgement

بەوشێوەیە هەرکەس دەتوانێ بە ڕاهێنان و وردبوونەوە هەروەها چاودێری دەرفەتەکان بۆ زاڵبوون بەسەر دژبەردا یان بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوشێوە لەو هونەرەدا ببێتە شارەزا و ئوستاد.

بۆیە ئەگەر لۆژیک لێرەدا نەتوانێ ڕۆڵ و دەوری کارێک بگێڕێ، دیالۆگیش بەهیچ شێوەیەک هیچی پێناکرێ.

هەمیشە دەبێ بابەتی لقێکی زانستی بەتەواوی لە بابەتەکانی دیکە و لقەکانی جیا بکەینەوە.

بۆ ئەوەی کە بۆچوونێکی ڕوونمان لەسەر بواری دیالۆگی هەبێ، دەبێ بەتەواوی هەقیقەتی عەینی کە بابەتی لۆژیکە فەرامۆش بکەین.

ئێمە دەبێ زۆر بەتوندی دیالۆگ بە هونەری سەرکەوتن لە گفتوگۆدا بناسین (خۆ ئەگەر لەسەرهەقیش بووین باشتر و ئاسانتر).

خوێندنەوەی مشتومڕ خۆی لەخۆیدا تەنیا ئەوە دەردەخا کە مرۆڤ چۆن دەتوانێ لە بەرانبەر هێرشە جۆراوجۆرەکان بەتایبەتیش هێرشە فریودەرەکان بەرگە بگرێ، بەهەمان شێوەش ڕوونی دەکاتەوە کە مرۆڤ چۆن بتوانێ بەرپەرچی قسەی خەڵکی دیکە بداتەوە، بێ ئەوەی پێشێلی قسەی خۆی بکات، یان بەشێوەیەکی گشتی بێ ئەوەی شکەست بێنێ.

دۆزینەوەی هەقیقەتی دیار، دەبێ لە هونەری دەربڕینی ڕای گونجاو و بەجێوڕێ لەکاتی پێویستدا شارەزابێ.

هەقیقەتـــی دیـــار بـــابەتێکی تەواو جیـــاوازو ســـەربەخۆیە کە بەشـێوەیەکی ســەرەکی پەیوەنـدی بە ئەزمـوون و خـۆڕاگری هەیە و هیچ هونەرێکی تایبەتی و قورسی تێدا نییە.

کەواتا ئامانجی دیالۆگ هەمان شتە ئەویـان لە شـێوەی لـۆژیکی دیـــاردا پێناســـە کـــردووە، بەڵام ئەم پێناســـەیە هەڵەیە، چـــونکە لەوکاتانەدا تەنیا دەتـوانین بـۆ بەرپەرچـدانەوەی قسـە و گـوتەی درۆ بەکاری بێنین.

تەنانەت لە کاتێکدا کە کەسـێک تەواو لەسـەر هەقە دووبـارە بـۆ بەرگریکردن و پاراستنی ئەو دەسکەوتە پێویستی بە دیالۆگ هەیە.

ئەو دەبـێ گاڵتەجـاڕی و لـووتبەرزییە فریودەرانەکـان بناسـێ تـا بتوانێ تەواوی ئەو فڕ و فێڵانە بەکاربێنێ تا دوژمن بە چەکـی خـۆی بەردەست بکات.

لەو بـارەوە لە بـابەتی دیالۆگیـدا دەبـێ هەقیقەتـی دیـار وەک پێشهاتێک لەپڕ تەماشا بکەین تەنیـا لەبیـری بەرگریکـردن لە بـابەتی خۆمان و بابەتی دژبەرەکەماندا بین.

هەقیقەت لە قوڵاییەوە هەڵقوڵاوە لەسـەرەتای هەر بابەتێکـدا هەر یەک لەکـام لایەنەکـان بەشـێوەیەکی سروشـتی پێیـان وایە کە هەق بەلای ئەودایە، لە درێـژەی گفتوگـۆ و لێدوانـدا هەردووکیـان دەکەونە گومانەوە ڕاستیەکە تا کۆتایی گفتوگۆکە یەکلایی نـابێتەوە و جێگیـر نابێ، بەو شێوەیە دیالۆگ هێندە پەیوەندی بە هەقیقەتەوە نییە.

ڕێک بەهەمان شێوەی کە کاتێ دووکەس بۆ (دوئێل[8]) بەگژ یەکدا دەچن مامۆستای شمشێربازی هێندە کاری بەسەر ئەوەوە نییە کە کێ لەسەر هەقە دوئێل شتێک نییە جگە لە هێرش و بەرگری.

هونەری شمشێربازی فکریش بەهەمان شێوەیە؛ تەنیا بەو شێوە تێگەیشتن و قبوڵکردنەوە کە دەتوانین پەی بە لقێکی مەعریفە بەرین[9]. دیالۆگ بەو مانایە تەنیا ئامانجی بریتییە لە کەمکردنەوەی سیستەمی یاسایی. نمایشی ئەوە کە زۆربەی مرۆڤەکان لەکاتی گفتوگۆدا بۆیان دەردەکەوێ ئەوان لەسەر هەق نین، سەرەڕای ئەوەش تێدەکۆشن سەرکەوتووبن، ئەمانە بەکار دەبەن..

---

[8] - دوئێل، ڕووبەڕووبوونەوە و لەگژیەکراچوونی دووکەس بەمەبەستی بەیەکتر سەلماندن و لە ڕووسیا بەمەبەستی گێڕانەوەی ئابڕووی تکاو، ئەنجامدراوە. ڕووبەڕووبوونەوەکە پێشتر بەشمشێر و ئینجا بەچەک بووە و زۆرجار بەبریندار بوونی یان مردنی یەکێک کۆتایی پێهاتووە.

[9] - ئەگەر ڕاستەوخۆ بەشوێن حەقیقەتی عەینیدا وێڵبین، دەگەینە ئاستی لۆژیکی بەرجەستە، ئەگەر تەنیا بەشوێن بابەتی درۆینەوە بین، ئەوە کارێکی تەواو سۆفستاییانەمان کردووە .لەهەردوو حاڵەتەکەدا دەبێ ئەوە بزانین کە چ شتێک ڕاست و چی ناڕاستە.

لەحاڵێکدا کەبەدەگمەن پێشبینی بۆچوونێکی ڕوونمان کردووە. لێکەوتەی ڕاست لەجەدەل هەمان شتە کە ئێمە وێنامان کردووە: جەدەل بریتییە لەشمشێربازی فکری کەبەمەبەستی سەرکەوتن لە گفتوگۆدا بەکاردەبرێ. ئەگەر چی ناوی شەڕەقسەو دەمەقاڵێ بۆ ئەو گونجاوترە بەڵام ناوی دەنێین دیالۆگی مناقەشە ئامێز.

بە مانایەکی دیکە دەتوانین بڵێین کە مەشغەڵەتی سەرەکی زانستی دیالۆگ بریتیە لە پۆلێنکردن و لێکۆڵینەوەی فێڵە فریودەرەکان تا لە توێژینەوەیەکی ڕاستەقینەدا بەپەلە بناسێنرێن و ببنە بلّقی سەر ئاو.

تا ئەو شوێنەی لێکۆڵینەوە بەرفراوانەکەی من نیشانی دەدا، تا ئێستا هیچ کاتێک لەو بوارەدا ئەنجام نەدراوە، بەو پێیە ئەو مەودایە وەک زەوییەکی بەیار دەمێنێتەوە.

بۆ گەیشتن بە ئامانجمان دەبێ کەڵک لە ئەزموونی خۆمان وەرگرین دەبێ بتوانین کە لەو توێژینەوانەدا کە زۆربە لەمەڕ هەڵسوکەوت و تێکەڵی ئێمە لەگەڵ خەڵکی دیکە لەخۆ دەگرێ، هەریەک لە لایەنەکان بەچ شێوەیەک کەڵک لەو فرت و فێڵانە وەردەگرن.

بە تێگەیشتن لە ڕەگەزە هاوبەشەکان فرت و فێڵەکانی کە لە شێوەی جیا جیادا دووبارە دەبنەوە، دەتوانین هەندێ فێڵی دیاریکراو بەکار بێنین کە لەوانەیە هەم بەکەڵکی ئێمە و هەم بە کەڵکی کەسانی گیرۆدە و نا ئومێد بێن.

ئەوەی دەرەقەتی دێت هەوڵی یەکەمە لەو زەمینەدا.

# (١)

## «پێواژی گەواهی پەرەپێبدە»

بەو تەڵەکەیە دەتوانی مەسەلەی دژبەرەکەتان لە سنووری سروشتی تێپەڕێنی، ئەوەندەی دەلوێ لێکدانەوە و مانای گشتی و ڕاشکاوی بۆ بکەی، تا بتوانی لەبارەیەوە زیادەڕۆیی بکەی لە لایەکی دیکەوە تا ئەو جێیەی دەتوانی مانای دیاریکراو و سنووردار بۆ بابەتی خۆت دیاری بکەی، بۆیە تا دەربڕینەکە گشتیتر بێ، دەتوانی ڕەخنەی زیاتر لە دژبەرەکەت بگری.

داکۆکی وابەستەیە بە دەربڕینی ڕاست و خاڵ یا بابەتی سەرەکی و بەهێز لەبارەی باسەکەوە.

**نموونە/١**

من دەڵێم بەریتانییەکان لە هونەری نواندن (دراما)دا سەرقافڵەن.

دژبەرەکەم هەوڵدەدا بەڵگەی پێچەوانەم بۆ بێنێتەوە و لەوەڵامدا دەڵێ: ئەوە ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە کە بەریتانییەکان لە هونەری مۆسیقا و سەرەنجام ئۆپێرادا دەستە پاچەن.

من بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو ڕایەی ئەو وەبیری دێنمەوە کە مۆسیقا بەشێک نییە لە هونەری دراما (نواندن) و هونەرەکانی نواندن زیاتر

ترازیدی و کۆمیدین، ئەو ئەوەی باش دەزانێ بەڵام هەوڵیدەدا بابەتەکەی من بەشێوەیەک ڕابگەیەنێ کە تەواوی هونەرە نمایشییەکان سەرجەم بوارەکانی تریش لەخۆ دەگرێ و لەناویشیاندا مۆسیقا و ئۆپێرا، تا بەو شێوەیە من ببەزێنێ.

بە پێچەوانەوە بۆ دەربازکردنی بابەتەکەی خۆم دەتوانم بەرە و سنوورێکی بەرتەسکتر لەوەی سەرەتا لەبەرچاومان گرتبوو ڕابکێشم، هەڵبەت ئەگەر شێوازی دەربڕینمان هاوکاربێ.

نموونە/٢

کەسی یەکەم ڕایدەگەیەنێ کە پەیمانی ئاشتی ساڵی ١٨١٤ سەربەخۆیی تەواوی شارەکانی ئەڵمانی کۆمەڵەی هانزایی بۆئەوان گێڕایەوە کەسی دووهەم بەهێنانەوەی بەڵگەی پێچەوانە ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات کە دانتزیگ کە لە بوقاپارت جیابۆوە، بەهۆی ئەو پەیمانەوە سەربەخۆی خۆی لەدەستدا.

کەسی یەکەم بەو شێوەیە خۆی دەرباز دەکات: «من گوتم تەواوی شارەکانی ئەڵمانیا، لە حاڵێکدا دانتزیگ لە (هەنگاریا) هەڵکەوتووە.»

**نموونەی/٢**

لامارک دەڵێت: پۆلیپ[١٠] بێ هەستەوەرە، چونکە دەمارە خانەی نییە.

سەرەڕای ئەوە دیارە هەندێ توانای دەرککردنی هەیە چونکە بە جووڵەوە و بەشێوەیەکی زۆر داهێنەرانە لە لقێکەوە دەچێتە لقێکی دیکە و لە ڕاستیدا بەدوای ڕووناکیدا دەگەڕێ، بەشی خۆراکی خۆی ڕاو دەکات.

بۆیە وای لێک دەدەنەوە کە کۆئەندامی دەماری پۆلیپ بە شێوەیەکی یەکسان بەسەر تەواوی ئەندامانی جەستەی دابەش بوون، بەشێوەیەک کە لە ناویاندا تواوەتەوە.

بۆیە دیارە بێ ئەوەی پۆلیپ ئەندامە هەستیارە جیاوازەکانی هەبن جۆرێک هێزی دەرککردنی هەیە.

لەو شوێنە کە ئەو تیۆریەی رایەکەی لامارک ڕەت دەکاتەوە دەڵێ: «لەو حاڵەتەدا وا پێویست دەکا کە تەواوی ئەندامانی لەشی توانای هەرجۆرە هەستیارییەک، جوڵە، ئیرادە و ئەندێشە بێت بەهەمان شێوە لەهەر جێگەیەکی لەشی پۆلیپ هەموو ئەندامەکانی تەواوترین بوونەوەر هەیە دەتوانێ هەر شوێنێکی جەستەی ببینێ، چێژ بکا، بۆن بکا، ببیستێ و کارگەلێکی لەو شێوە ئەنجام بدات.

لە ڕاستیدا دەتوانێ بیربکاتەوە، بڕیار بدا و بە دەرەنجام بگات، هەر خانەیەکی لەشی ئاژەڵێکی تەواوە و پۆلیپ لە مرۆڤ هەستیارتر

---

[١٠] - Polyp

و لە پێشترە چونکە هەر بەشێکی لەشی تەواوی هەستەوەرەکانی دیکەی تێدایە، کە تەنیا لە گشتی لەشی مرۆڤدا ئەوە بەدی دەکرێ.

سەرەڕای ئەوەش هیچ هۆکارێک نییە ئەوەی سەبارەت بە پۆلیپ دەگوترێ، بەتەواوی مونادەکان، واتا نوقسانترینی بوونەوەران لەکۆتایشدا گیایەکان کە ئەوانیش زیندەوەرن و زۆر شتی دیکەش.

ئەو نووسەرەی کە ئەوجۆرە تەڵەکە دیالۆگیانە بەکار دێنێ نیشانی دەدا کە لە نادیاری ئاگای لە هەڵەی خۆیەتی.

چونکە گوتویانە کە هەموو لەشی پۆلیپ بەرانبەر بە ڕووناکی هەستیارە و بەوەدا دیارە کە هەستەوەری هەیە و ئەو گەنگەشەی ئەو دەیکا کە هەموو لەشی پۆلیپ دەمارەخانەی هەیە کەواتە توانای بیرکردنەوەشی هەیە!!

## (٢)
## «کەڵک لە هاوبەشە دەنگیەکان وەربگرە»

لەو تەڵەکەیەدا بابەتەکە بە شتێکەوە دەبەستینەوە کە جگە لە لێکچوونی دەربڕین هیچ پەیوەندیەکی جەوهەری لەگەڵ بابەتی بەرباس و لێکۆڵینەوە نییە، یان سیمای بەشداری ئەو بابەتەی باسدەکرێ زۆر کەمە ئەوجا ئەوبابەتە سەرکەوتوانە ڕەت دەکەینەوە.

بەو شێوەیە گەنگەشە دەکەین کە قسەی سەرەکیمان ڕەتکردۆتەوە.

لێرەدا دەبێ ئەوە بخەینە ڕوو کە هەرکات دوو وشە هاو واتا بوون ئەو دوو وشەیە مرادیفی یەکدین، هەرکاتیش دوو مانا بەهۆی وشەیەکەوە بخرێنە ڕوو ئەو وشە هاوبەشە دوانییە.

وشەکانی «deep», «cutting» و «high»[11] دەتوانین هەم بۆ وەسفی دەنگەکان و هەم بۆ وەسفی شتی دیکە بەکار بەرین، چونکە ئەو وشانە لە بابەتی جیاجیا دا مانای جیاوازیان هەیە هاوبەشی دوانین لە حاڵێکدا کە «honourable» و «honest»* هاوواتان و هەردووکیان بەمانای «شەریف» دێن.

---

[11] - هەرکاتێ ئەو ناوانە بۆ وەسفی دەنگەکان بەکار ببەین بەڕیز بەمانای دەنگی عوود، دەنگی بێزارکەر، دەنگی گڕ، دێن. بەڵام لەشوێنی دیکەش بەمانای جیاوازی وەک قووڵ، تیژ، بەرز یان هەیە.

هەر ڕووناکییەک دەشێ خامۆش بکرێ

ئاوەز جۆرێکی ڕووناکییە

کەواتە دەشێ ئاوەزیش خامۆش بکرێ.

لێرەدا تەواو ئاشکرایە کە لەو ئەندازەیە چوار ئاست بوونی هەیە وە ڕووناکی بەهەردوو مانای ڕاستەقینە و «خوازراو» بەکار براوە، بەڵام ئەگەر سەفسەتە شێوەیەکی ناهەستی و ژیرانەی هەبێ دەتوانێ ئێمە گومڕا بکا، بەتیبەتی کاتێک وشەیەک مانا گەلێک لەخۆ دەگرێ کە پەیوەستن بەیەکەوە و دەتوانرێ شوێن گۆڕکەیان پێبکرێ.

ئەگەر سەفسەتە بە ئەنقەست بەکاربهێنرێ هەرگیز بەو ئەندازەیە ناهەستیار و هۆشیارانە نابێ کە کەس ئەو تەفرە بدات، بۆیە دەبێ نموونەکانی لە ئەزموونی کردەیی و تاکە کەسی کۆبکەینەوە.

زۆر باش دەبێ ئەگەر بتوانرێ هەر تەڵەکەیەک بەناوی کورتکراوەوە و ئاشکرا دیاری بکەین، بەشێوەیەک کاتێ کەسێک ئەو یان ئەو تەڵەکەیەی بەکار هێنا یەکسەر بتوانێ بەرەو ئەو ئاقارە ڕینمایی بکا کە دەیەوێ.

دوو نموونە لەسەر بەشداری دوانی (لەفزی) دێنمەوە:

**نموونەی/١**

کەسی یەکەم: «تۆ هێشتا ئاگایت لەسەر نهێنییەکانی فەلسەفەی کانت نییە»

کەسی دووهەم: «ئۆ، ئەگەر تۆ دەتەوێ لەسەر نهێنییەکان قسەم بۆ بکەی، من پێت دەڵێم ئەوە هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە.»

**نموونەی/٢**

من بنەمایەک کە لەسەر بناغەی شەرافەت و کەرامەت دانرابێ بەو ناونیشانە کە بنەمایەکی گەمژانەیە حیساب دەکەم، چونکە لەسەر ئەو بنەمایە هەرکات کەسێک ویستی تێکم بشکێنێ شەرافەت و کەرامەتم لەکەدار بووە، ناشتوانم ئەو لەکەدارییەش بسڕمەوە مەگەر ئەوە کە زیاتر کەسەکە تێکبشکێنم و لەکەداری بکەم یان خوێنی دژبەرەکەم بکەمە کاسەوە.

بە باوەڕی من شەرافەت و کەرامەتی ڕاستەقینەی مرۆڤ بەدەست خەڵکی دیکە نییە و کەس ناتوانێ پێشێلی بکا، بەڵکو بەدەست خودی مرۆڤەکە خۆیەتی، چونکە ڕوون نییە هەریەک لە ئێمە چیمان بەسەردێ و لە ژیانماندا چی ڕوو دەدا.

لایەنی بەرانبەر بەو هۆیەوە هێرش دەکات و دەیەوێ سەرکەوتوانە بەمنی بسەلمێنێ کە کاتێ کاسبکارێک بە ناهەق و درۆ و دەلەسەوە دەیەوێ بە گەندەڵی لەکارەکەمدا تاوانبارم بکا، شەرافەتی خۆی لەکەدار بووە.

لەو کاتەدا لەلایەن خەڵکی دیکە کەرامەتی لەکەدار بوە و تەنیا بەو هۆیەوە کەرامەتی بۆ دەگەڕێتەوە کە سزای کەسەکە بدات و ئەو

کەسە ناچار بکا لە قسەکەی پاشگەز بێتەوە و داوای بەخشین بکات.

لێرەدا دژبەر دەیەوێ بەهۆی بەشداری دوانی (لەفزی) شەرافەتی مەدەنی، یان ناوجوانی[١٢]، لە شوێنی شەرافەتی شاسوارانە یان نیشانی شەرافەت جێگە پێبگرێ.

یەکەمیان بە تۆمەت و بوختان و دووهەمیان بە ئیهانەکردن و شکاندن لەکەدار دەبێ، چونکە ناتوانین چاوپۆشی لە هێرشی سەر یەکەمیان بکەین، بۆیە دەبێ ئەویان بە وەڵامدانەوەی ئاشکرا ڕەتبکەینەو و بەهەمان شێوەیش ناشێ دووهەمیان پشتگوێ بخەین و دەبێ ئەویشیان بە (دوئیل) و ئیهانەکردنی زیاترەوە وەڵام بدەینەوە.

لێرەدا دووشت لەسەر بنەمای جیاواز بەهۆی بەشداری زارەکی لە وشەی( شەرافەت) و لە کۆتایدا گۆڕان و تێکەڵبوونی قسەی سەرزار ڕوودەدا.

---

١٢- good name

## (٣)

## «پێواژەی تایبەتی بە دژبەرەکەت ڕابگەیەنە»

لە تەڵەکەی دیـکەدا بـابەتەکە تـایبەتە بەشـتێکی تـایبەتی، بەشێوەیەک دەیخەمەڕوو کە شتێکی گشتی یان ڕەهایە، یان لانـیکەم نێـوێکی جیـاواز لەوانـی دیـکەی لێـدەنێم و ئەوجـا ڕەتـی دەکەمەوە، نموونەی ژێرەوە بە لێکدانەوەی ئەرستۆ:

عەرەبـی مەغریبـی ڕەشـن، بەڵام بە تێبینـی ددانەکانیـان سـپین، کەواتە لەو یەکەدا هەم ڕەش و هەم ڕەش نییە.

ئەوە سەفسەتەیەکی ئاشکرایە و کەس تەفرە ناخوا.

مـۆڵەتم بـدە ئەوە لەگەڵ سەفسـەتەیەک کە تـاقیم کـردۆتەوە بەراورد بکەم.

لەباسـەکەدا لەمەڕ فەلسـەفە دەرمخسـتووە کە سیسـتەمی فکـری مـن لەلایەن ئەهلـی خـۆی پەسـەندە و لە هەمـان کاتـدا ستایشـی ئەوانیش دەکا، کەمێ دواتر بابەتی هیگڵ دێتە پێشەوە.

مـن گەنگەشـەی ئەوەم کـرد کە بەشـی زۆری بەرهەمەکـانی ئەو کرچ و کاڵ و بێتـامن، یـان لە زۆربەی نووسـینەکانیدا هیگـڵ بـابەتی نووسـیوە و وشـەی ڕێزکـردوە و مانـا و لێکـدانەوەی بە خـوێنەران ئەسپاردووە.

دژبەرەکەی من نەیتوانی ئەو بۆچوونەی من ڕەت بکاتەوە بەڵام بۆ کەیف و دڵخۆشی خۆی پێیگوتم: کە ماوەیەکی کەم لەمەوبەر مەشغوڵی ستایشی ئەهلی ڕەزا بووم چارەنووس باوەڕانیش هەڵیت و پەڵیتی زۆریان نووسیوە.

ئەو قسەیەم پەسەند کرد، بەڵام بە مەبەستی ڕاستکردنەوەی قسەکەی پێمگوت: پەسنی چارەنووس باوەڕان دەکەم، بەڵام نەک وەک فەیلەسوف و پیتۆڵەکان.

بەواتایەکی دیکە نەک بەهۆی بەدەستهاتوو بەرهەمەکانیان لەبواری تیۆریدا بەڵکو تەنیا وەک مرۆڤ و لە پلەی مرۆڤدا و لە پێناو کردار و ڕەفتاریان لە بواری کاردا، ئێستا وەک ئەوەی سەبارەت بە هیگڵ باسی دەکرد بەو شێوەیە هێرشەکەیم تێکشکاند.

ئەو سێ تەڵەکەیەی پێشوو خەسڵەتی هاوشێوەیان هەیە سیمای هاوبەشی ئەو تەڵەکانە ئەوەیە کە بەهۆیانەوە هێرش دەبەینە سەر شتە جیاوازەکان ئەوانەی کە دژبەرەکەمان پەسەندی کردوون.

لە تەواوی ئەو نموونانەی خستوومنەڕوو وشەی دژبەر ڕاستە، بەڵام بەهەڵگرتنی* ناهاوسەنگی ڕواڵەتی نابێتە واقیعی کەسێک کە لەلایەن دژبەرەوە هێرشی دەبرێتە سەر تەنیا ئەوەندەی بەسە ڕاستی متمانەی لۆژیکی دەرەنجامەکەی کە دژبەر خستوویەتەڕوو ڕەتی بکەیەوە (کەواتە بابەتەکەی ئەو ڕاستە و ئەوەی ئێمە درۆیە)، بەو شێوەیە و خۆی لەخۆیدا ناخی نەرێنی دژبەر بەبێ دواکەوتن دەرەنجامەکەی خۆی ڕەت دەکاتەوە.

***

تەڵەکەیەکی دیکە سەرپێچی کردن لەوەرگرتنی پێشەکی ڕاست بەهۆی ئەو دەرەنجامەی پێشبینی دەکەی، لە دوو بەشی دوایدا لە پێناو کردنە بڵقی سەرئاو و هەڵوەشاندنەوەی ئەو دوو جۆرە تەڵەکەیە ڕوونکردنەوەمان دەبێ.

## (٤)

## «دەستی خۆت کەشف مەکە»

ئەگەر دەتەوێ بگەیتە دەرەنجامێک، نابێ بهێڵی نیەتت پێشبینی بکرێ، بەڵکو دەبێ کارەکانت بە هەنگاو و بێ ئەوەی سەرنجی کەسی بەلادا ڕاکێشی، بەشێوەی پچڕ پچڕ و لەمیانی قسەکردنت لەگەڵ دژبەرێکدا بخەیتە ڕوو.

ئەگەر وانەکەی ئەو بە جۆرەها سەفسەتە دەتوانێ پێشگیریت لێبکا.

ئەگەر دڵنیا نەبووی کە دژبەرت ئەو پێشەکیە قبووڵ دەکا دەبێ پێشەکی ئەو پێشەکییە بخەیتەڕوو بە واتایەکی دیکە دەبێ هەندێ لە وردیاتی ئەو پێشەکییە بە دژبەرەکەت بسەلمێنی و پێی قبووڵ بکەی.

بەو شێوەیە هەنگاو بە هەنگاو تا دژبەرەکەت بە تەواوی هەموو پێشەکییەکە قبووڵ نەکا تۆ نەخشەکەت ئاشکرا ناکەی.

بەو شێوەیە دەتوانی ئەو لەسەر ڕێی خۆت لابدەی و بە ئامانج بگەی، ئەمە ئەو تەڵەکەیە پێویستی بەهیچ نموونەیەک نییە.

## (٥)

## « پەنا بۆ دەسپێکی درۆ ببە »

بۆ سەلماندنی ڕاستی بابەتەکە دەتوانی کەڵک لەو بابەتانەی پێشەوە وەربگری کە ڕاست نین وەرگری، دیارە ئەگەر دژبەرەکەت لاری لە قبووڵکردنی بابەتە ڕاستەکاندا هەبوو.

(بەڵکو بەو هۆکارەی کە ڕاستی ئەوان درک ناکات، یان لەو ڕووەوە کە دەزانێ کە دەستپێک لەوانەوە سەرچاوەدەگرێ.)

لەو حاڵەتەدا دەبێ بابەتگەلێک هەڵبژێری کە خۆی لەخۆیدا درۆن بەڵام لەڕوانگەی دژبەرەکەتەوە ڕاستن و دەبێت لەڕووی بیرکردنەوەی ئەوەوە بڕیار بدەی، بۆی هەیە دەرەنجامی ڕاست لە پێشەکی درۆوە سەرچاوە بگرێ بەڵام بە پێچەوانەوە ناشێ.)

بەهەمان شێوە دەتوانی بابەتە درۆیەکانی دژبەرەکەت لەگەڵ بابەتگەلی درۆی دیکە کە لە ڕوانگەی ئەوەوە ڕاستن بەرپەرچ بدەیەوە ئیتر تۆ سەروکارت لەگەڵ هەیەو دەبێ هەمان بیروباوەڕ کە ئەو کەڵکی لێوەرگرتووە بەکار بێنێ.

بۆ نموونە ئەگەر ئەو ئەندامی تیپێکە کە تۆ پەیوەندیت لەگەڵ نییە دەتوانی ئەوشتانەی لەسەر ئەو تیپە هەتە وەک خاڵی لاواز بەسەر ئەویاندا بسەپێنی.

## (٦)
## « ئەوشتەی کە دەبێ بسەلمێنرێ، بە دڵنیایی و زۆر بیسەپێنە »

نەخشەیەکی دیکە بریتییە لە دەستبەسەرداگرتنی داواکراو لە سیمایەکی دیکەدا، دیارە ئەو شتە کە دەبێ بسەلمێنرێ هەندێجار:

١) لەژێر ناوێکی دیکەدا، بۆ نموونە: ناوبانگی باش لەشوێنی شەرافەت (پاکی) لە شوێنی دەستلێنەدراوی ....هتد یان بە کەڵک وەرگرتن لە زاراوە گەلێک کە بتوانی هەڵی گێڕیەوە، لە نموونەی (ئاژەڵانی خوێن گەرمی گۆڕاو) و (شیردەرەکان).

٢) بە پەسەندکردنی شیمانەیی کە بابەتی مایەی لێکۆڵینەوە لەخۆدەگرێ بۆ نموونە: باوەڕ بە نەبوونی مستەحیل لە زانستی پزیشکیدا، لە ڕاگوزەردا سەپاندنی دڵنیای و نەپساندنی گشتی زانستی مرۆیی.

٣) ئەگەر بە پێچەوانەوە دووشت لەسەر یەکتر دەرەنجام وەردەگرن و بڕیارە یەکێ لەوانە بسەلمێنرێ دەتوانی ئەوی دیکەیان بە تەواوی بسەپێنی.

٤) ئەگەر بڕیاربێ چوارچێوەی گشتی بسەلمێنێ دەتوانی تەواوی بەشەکانی بابەتی باس بە دژبەرەکەت بسەلمێنی (ئەوە پێچەوانەی حاڵەتی دووهەمە).

## (٧)

## «دژبەرەکەت لەپرسیاراندا گێژبکە»

ئەگەر بابەتەکە بەشێوەی ورد و رێک و پێک بچێتە پێشەوە، هەردوولا بیانەوێ درک و خوێندنەوەی باشیان بۆی هەبێ ئەو کەسەی کە بابەتەکە دەخاتەڕوو دەیەوێ بیسەلمێنێ، دەتوانێ بە خستنەڕووی پرسیارێک بناغەی بابەتەکە پتەو بکا، تا بەوشێوەیە ڕاستی بابەتەکە بە دژبەرەکەی بسەلمێنێ (ئەوە شێوازی سوقڕاتە و لە کۆنەوە باو بووە و ئەو تەڵەکەیە و زۆر تەڵەکەی دیکەش کە لە داهاتوو دەیانخەینەڕوو شێوازی سوقڕاتن).

لەسەر ئەو بنەمایە دەبێ هاوکات پرسیاری زیاتری ئاڵۆز ئاراستەی دژبەرەکەت بکەیت بەشێوەیەک کە ئەو نەزانێت تۆ دەتەوێ چ بابەتێک بخەیتەڕوو دوای ئەوەش دەبێ بەخێرایی دەرەنجامی باش لە وەڵامەکانی ئەو کاوێژ بکەیتەوە.

ئەوانەی بێ زەین و دەبەنگن ناتوانن بە باشی درێژە بە بابەتەکەی خۆیان بدەن و ئاگایان لە هەڵە و خستنەڕووی بەڵگە لاوازەکانی تۆ نامێنێ.

## (٨)

## «دژبەرەکەت تووڕە بکە»

دژبەرەکەت تـووڕەبکە چـونکە کـاتێ تـووڕەبێ توانـای پـۆلێن و جیاکردنەوەی نامێنێ و نازانێ چ شتێک و ڕستەیەک لە قازانجیەتی.

بۆ ئەوەی تووڕەی بکەی دەبێ بەردەوام لە بەرانبەریدا بێویژدانی بنـوێنی، یـان بەجۆرێـک لە جۆرەکـان بەداوی هەڵەکانیـدا بگەڕێـی و تیرو توانجی لێبدەی بەگشتی دەبێ مرۆڤ بێ ئەدەب بێ!

## (٩)

## «پرسیاری لابەلا بکە»

دەتـوانی پرسـیاری جۆراوجـۆر بەشـێوەی جیـا و وەک ئەوەی دەرەنجامی بابەتەکە دەیخوازێ بخەیتەڕوو، پرسیارەکانیش بەجۆرێ پـاش و پـێش پێـبکەی کە دژبەرەکەت نەزانـێ تـۆ چ مەبەسـتێکت هەیە.

لەو حاڵەتەدا ئەو ناتوانێ بۆ هیچ ئەگەرێک کە تۆ لەوێوە هێـرش دەکەی، خۆی ئامادە بکات.

هەروەها دەتوانی وەڵامەکانیشیان بـۆ بەدەسـتهێنانی دەرەنجـامی جیاواز و تەنانەت پێچەوانەشی بە چلۆنایەتی ئەوان بەکار ببەی، ئەو تەڵەکەیە هاوشێوەی تەڵەکەی دەستی خۆت ئاشکرامەکە یە.

{لەگەڵ تەڵەکەی چوارەم بەراوردی بکە]

## (١٠)

## «ئەگەر کەسێک وەڵامی نەرێنی پرسیارەکانتی دایەوە فێڵی لێ بکە»

ئەگەر زانیت دژبەرەکەت لەبری وەڵامی ئەرێنی وەڵامی نەرێنی ئەو پرسیارانەت دەداتەوە کە بۆ بەهێز کردنی بابەتەکەت ئاراستەی دەکەی، دەبێ پێچەوانەی بابەتەکەی ئاراستەی بکەی.

تۆ وادەربخە کە چاوەڕێی وەڵامی ئەرێنی ئەوی بۆ ئەو پرسیارانە، یان بەهەر شێوەیەک بووە تۆ دەتوانی ئەو بخەیتە نێوان هەردوو هەڵبژاردنەکەوە، بەشێوەیەک کە نەزانێ تۆ چاوەڕوانی وەڵامی ئەرێنی کام یەک لە پرسیارەکانی.

## (١١)

# «قبووڵکردنی دەرفەتی تایبەتی ڕابگەیەنە»

ئەگەر دەکەویتە بەڵگە هێنانەوە و دژبەرەکەت چەند لایەنێکی تایبەتی بابەتەکە پەسەند دەکا، نابێ لێی بپرسی کە دەرەنجامی پەسنی ئەو چەند لایەنە و نموونە بە گشتی بابەتەکەی قبووڵە یان نا.

بەڵکو دەبێ ئەو بخەیتە دۆخێکی نەگۆڕ و قبووڵکراوەوە.

لەو نێوەدا ئەویش دێتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەوەی قبووڵکردووە، ئامادەبوانیش هەموویان دێنە سەر ئەو ڕایە، ئەوان سەبارەت بە بابەتە لاوەکییەکان پرسیاری زۆریان دەکەوێتەوە زەین و خەیاڵەوە و وای بۆدەچن کە وەڵامی ئەو پرسیارانە دراوەتەوە و گەیشتوونە دەرەنجام.

## (١٢)

## «خوازەی گونجاوی بابەتەکەت هەڵبژێرە»

ئەگەر بابەتەکەت تەوەرێکی سەرەکی گشتییە و هیچ ناوێکی تایبەتی نییە بەڵام دەخوازی ناونیشانێکی مەزاجی هەبێ، دەبێ خوازەیەک دەستنیشان بکەی کە لەگەڵ بابەتەکە بێتەوە.

بۆ نموونە: ئاشکرایە کە ناوی دوو حیزبی سیاسی ئیسپانیا واتا «نەریت خوازان» (serviles) و ئازادیخوازان، حیزبی ئازادیخوازانی هەڵبژاردووە، پرۆتستانت و ئینجیلییەکان بۆخۆیان ناویان بۆخۆیان دیاری کردووە، بەڵام کەتەلۆنییەکان ئەوان بە کافر و غەیرەدین دەزانن.

سەبارەت بە ناوێک، شتگەلێک کە مانای وردتر و دیاریکراوتر دەخوازێ، بابەتەکە بەهەمان ڕوواڵەتە.

بۆ نموونە: ئەگەر دژبەرەکەت گۆڕان یان زاراوەیەکی دیکە پێشنیاز دەکا دەتوانی ئەوە بە (بدعە) ناو ببەی کە دەستەواژەیەکی داخ لە دڵانە و بوغزێنراوە.

بەڵام ئەگەر بۆخۆت ئەو پێشنیازە بخەیتەڕوو دۆخەکە پێچەوانە دەبێتەوە. سەبارەت بەوەی یەکەمیان دەتوانی ئەسڵ بکەی بە (پرەنسیپی بەردەست) لە حاڵەتی دووەمدا دەتوانی ئەوە

وەک (توندرەوی کۆن) لێک بدەیتەوە، ئەوەی کە کەسێک بێلایەن و بێمەبەست بە (عیبادەتی گشتی) یان (پرەنسیپی ئاین) تێدەگەن، باوەڕدار و بێ باوەڕ بەدوای یەکدا بەشێوەی دینداری یان خواناسی و توندرەوی یان ترۆهات لێک دەدەنەوە.

ئەو تەڵەکەیە لە بنەواندا شێوازێکی گونجاوە بۆ دەستبەسەرداگرتنی کەسی داواکراو، پێش هەر شتێ بەوەی پێویستە بسەلمێنی دێتە نێو پێناسەکەوە و ئینجا بە شیکار و شیکردنەوەی بنەڕەتی دەچەسپێنرێ. ئەوە کە کەسێک (کەوتۆتە ژێر دەرخیاتەوە) حیسابی لەسەردەکەن یەکی دیکە (بە زیندانی کراو) لە قەڵەم دەدەن، وتاربێژ بەو ناوانەی کە لەشتەکانی دەنێ ئامانجەکەی خۆی لەسەرەتاوە دیاری دەکات، دەشێ یەکێ لە (ڕووحانی)یەکان و یەکێکی دیکە لە (قەشە)کان قسە بکات.

ئەو تەڵەکەیە لە تەواوی تەڵەکەکانی دیکەی قسەکردن ڕەواجی زیاترە بەشێوەیەکی غەریزەیی بەکار دەهێنرێ.

چەندین جار ئەو دەستەواژانەت گوێ لێ بوون: «جوانمێری ئایینی، توندرەوی، هەڵتریزان، عاشقی بنەڕەتی یان لاقەکاری» چیرۆکی «لەڕێ لادەر یان درێو و ناحەز»، «گرفتار بوون» یان «وێر شکەستەیی»، «لەڕیگەی دەسەلات و پەیوەندی» یان بەهۆی «پانکردنەوە، ڕووداری و واسیتەوە»، «سوپاسی بێ پایان» یان «ماستاوکردن».

## (١٣)

## «بە ڕەتکردنەوەی بەڵگەی پێچەوانە ڕازی بە»

لە پێناو ئەوەدا کە دژبەرەکەت ناچاربکەی بابەتێکی بەدەر لە ویستی خۆی پەسەند بکا، دەبێ بابەتی پێچەوانەش بخەیتە بەردەم و مافی هەڵبژاردنی لایەکی بدەیتێ، ئەوەندەی دەشتوانی نێوان و سێوانی ئەو دوو ڕێگەیەی بۆ ڕوون بکەوە، بە جۆرێک کە ئەو بۆ خۆپاراستن لە پێچەوانەکەی، بابەتەکەت لێ قبووڵ بکا، بابەتێک بەشێوەیەک داڕژا و دانرابێ کە ئەگەری هاتنەدی تەواو لەلا مسۆگەر کرابێ.

بۆ نموونە: ئەگەر دەتەوێ ئەو بهێنیتە سەر ئەو باوەڕەی کە منداڵێکی کوڕ هەرکارێک کە حەزی لێبێ دەبێ بیکات، لێی بپرسە ئایا دەشێ لە هەموو ئیش و کار و جوڵەکانیدا ڕاوێژ بە دایکوباوکی بکەین و پەیڕەوی ڕێنماییەکانیان بین؟

یان ئەگەر قسە لەسەر ئەوەیە «زۆربەی جار» ڕوو دەدات لێی بپرسە: دەستەواژەی زۆربەی جار مانایەکی دیاریکراو دەگەیەنێ یان زیاتر؟

دیارە ئەویش دەڵێ: «زۆر» وەک ئەوە وایە ڕەنگی خۆڵەمێشی لەتەنیشت ڕەش دابنێی و پێتوابێ سپییە یان لەتەنیشت سپی دابنێی و پێتوابێ ڕەشە.

## (١٤)

## «سەرەڕای دۆڕانت گەنگەشەی بردنەوە بکە»

ئەو تەڵەکە فێڵبــازانەیە بەو شـێوەیە جێبەجــێ دەکـرێ: کـاتێ وەڵامەکانی دژبەرەکەت بۆ هەندێ لە پرسـیارەکانت گونجـاو و بەپێـی خواسـتی تـۆ نەبـوو، دەرەنجـامی دڵخـوازی خـۆت بەجـۆرێ بـخەڕوو ئەگەرچی بەهیچ شێوەیەک بەو دەرەنجـامە پێویسـتە نەگەیشـتبی کە گوایە سەلمێنراوە و ئەوەش بە ڕاوێژێکی سەرکەوتوانە ڕابگەیەنە.

ئەگەر دژبەرەکەت شــەرمن یـان دەبەنــگ بــێ و تـۆش زۆر نــاخ چەپەڵ و زمان لووس بیت ئەو تەڵەکەیە بە ئاسانی جێگە دەگرێت.

## (١٥)

# «بابەتگەلێکی بەروالەت بێ مانا بەکاربێنە»

ئەگەر بابەتێکی ناتەبات خستەڕوو لەسەلماندنی ئەودا تووشی گرفت هاتی، دەتوانی بابەتێکی ڕاستەقینە بۆ ئەوەی دژبەرەکەت ڕەتی بکاتەوە یان قبوولی بکا بخەیەڕوو.

هەرچەند ڕاستی ئەو بابەتە زۆر ئاشکرا و دیار نییە و بەجۆرێکە وەک ئەوەی دەتەوێ بەڵگەکەت لە دەرەنجامەوە هەڵێنجی، ئەگەر ئەو گومانی لەوە هەبێ کە فرت و فێڵێک لە بابەتەکەدا هەیە و بەهەمان هۆوە ئینکاری لەو بابەتە ڕاستە بکات، دەتوانی ئەوە بخەیەڕوو کە قسەی ئەو چەندە ناماقووڵە و بەو شێوەیە سەردەکەوی.

ئەگەر ئەو بابەتەشی قبووڵکرد دیارە هەق بە تۆیە و ئێستا دەبێ پەرە بە نەخشە و پلانەکەت بدەی.

بەدەر لەو حاڵەتە دەتوانی تەڵەکەی پێشتر بەکار بێنی، قسە دژ بەیەکەکانت لە هەمان بابەتدا کە پێش ئەو سەلماندوویەتی ئەوە دەسەلمێنن ئەو تەڵەکەیە پێویستی بە چەپەڵیەکی زۆر هەیە، بەڵام ئەزموونی هەمیشەیی نیشانی دەدا کە کەسانێکی وا هەن بەشێوەی غەریزی و بەردەوام بەکاری دێنن.

## (١٦)

# «کەڵک لە ڕاکانی دژبەرەکەت وەرگرە»

کاتێک دژبەرەکەت بابەتێک دەخاتەڕوو دەبێ بزانی ئایا ئەو بابەتە بەجۆرێک- تەنانەت لەحاڵەتی پێویستدا، بەڕواڵەت لەگەڵ ئەو بابەتانەی خراوەتەڕوو یان قبووڵی کردووە، یان لەسەر بنەمای نووسینگە یان گرووپ کە ئەوی پەسەن و هەڵبژاردووە، یان بەکردەوەی پارێزەرانی ڕاستی یان ڕواڵەتی و درۆیینەی ئەو گروپە، یان بێ کردەوە و نییەتەکانی خۆی لاسەنگە یان نا.

بۆ نموونە: ئەگەر پێداگری لەسەر خۆکوشتن دەکات، دەتوانی خێرا دەنگت هەڵبڕی و بڵێی «بۆچی خۆت هەڵناواسی؟»

ئەگەر دەڵێ: بەرلین شوێنێکی گونجاو نییە بۆ ژیان. دەتوانی بڵێی: بۆچی بەیەکەمین شەمەندەفەر کە ئەمڕۆ دەردەچێ لێی ناڕۆی؟

لەوجۆرە زیادەڕۆیی و قسە پڕوپوچانە زۆرن.

***

بەڵگەی من داکۆکی لەو ڕاستیەدەکات کە :

١- خەسڵەتی دیار و جێ متمانە شێوازێکی گشتی هەیە، لەو کاتەدا بەڵگەکەم ڕاستە، تەنیا ئەو بەڵگەیە کە برەوی ڕاستەقینەی هەیە.

٢- تەنیا بۆ کەسێک گرنگە کە دەمەوێ بابەتەکەمی پێ بسەلمێنم واتا هەمان کەس کە قسەی لەگەڵ دەکەم، بەواتایەکی دیکە، ئەو جارێک بابەتەکەی بۆ هەمیشە و بەشێوەیەکی جیاوازی دەمارگرژی هەڵبژاردووە.

یان لەکاتی گفتوگۆدا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی قبووڵی کردووە، منیش بەڵگەی خۆم لەسەر ئەو بنەمایە دادەڕێژم لەو حاڵەتەدا، ئەو بەڵگەیە تەنیا بۆ ئەو کەسە تایبەتە گرینگی هەیە.

من دژبەرەکەم ناچاردەکەم بابەتەکەی من قبووڵ و پەسەند بکا، بەڵام ناتوانم ئەوە وەک ڕاستییەکی گشتگیری جیهانی بسەلمێنم.

بۆ نموونە: ئەگەر دژبەرەکەم لایەنگری کانت بێ و منیش بەڵگەکانم لەسەر هەندێ ڕاو وتەی کانت هەڵچنم، ئەو بەڵگانە هاوکات تەنیا تایبەت دەبن بە دژبەرەکەمەوە.

ئەگەر ئەو موسوڵمان بێ دەتوانم بە خستنەڕووی حەدیسێک یان خوێندنەوەی ئایەتێکی قورئانی ڕاستی قسەکەمی پێ بسەلمێنم کە ئەو بەڵگەیە تەنیا بەلای ئەوەوە پەسەند و قبووڵکراوە.

## (١٧)

## «بەڕوویەکی گەش و ئاسوودەوە بەرگری لەخۆت بکە»

ئەگەر دژبەرەکەت بە بەڵگەی بەهێزەوە تۆی خستە گێچەڵەوە زۆرترین کات دەتوانی بەڕوویەکی گەش و سیمایەکی خۆشەوە کە پێشتر بیرت لێنەکردۆتەوە خۆت لەو گێچەڵە دەرباز بکەی.

ئەڵبەت ئەگەر بابەتەکە دوو لایەنەبێت یان بتوانی لێکدانەوەیەکی ناڕوونی بۆ بکەیت.

## (١٨)

# «قسەی پێ ببڕە، لەنێو قسانیدا قسەبکە، بابەتەکە بە لاڕێدا ببە»

ئەگەر دەزانی دژبەرەکەت کۆمەڵێ بەڵگەی بەهێزی لەبەردەستدان و دەتوانێ تۆیان پێ ببەزێنێ، نابێ بهێڵی ئەوانە بگەیەنێتە دەرەنجامی کۆتایی.

بەڵکو دەبێ لەکات و شوێنی گونجاودا قسەکەی پێی ببڕی و بابەتی لاوەکی دیکە بهێنییە گۆڕێ.

بەکورتی شتێک کە لە جەوهەری بابەتەکە لایدەدا.

{لەگەڵ تەڵەکەی ٢٩ بەراوردی بکە]

## (١٩)

## «بابەتەکە بگشتێنە و ئەوجا بەپێچەوانەوە قسەبکە»

ئەگەر دژبەرەکەت ڕاستەوخۆ تۆ بەرەو دژایەتی خاڵێکی تایبەتی کە لە بەڵگەکانیدا دەتگرێتەوە و تۆش شتێکت بۆ گوتن پێ نەبوو دەبێ هەوڵبدەی بابەتەکە بگشتێنی ئینجا بەدژی ئەو قسەبکەی.

ئەگەر لێیان ویستی کە بڵێی لەبەرچی فلانە بابەتی تایبەتی فیزیکی {بە باوەڕی تۆ] مایەی پەسەند نییە؟ دەتوانی باس لە بەهەڵەداچوونی هەموو مرۆڤێک بکەی کە بۆی هەیە هەڵەبێ و چەندین نموونەش بهێنینەوە.

{لەگەڵ تەڵەکەی ٦ بەراوردی بکە]

## (٢٠)

## «خۆت بە دەرەنجام بگە»

کاتێ تەواوی ڕایەکانی خۆت هەڵێنجان و دژبەرەکەت پەسەندی کردن، نابێ دەرەنجام لەو بپرسی، بەڵکو دەبێ بێ درەنگ خۆت دەرەنجام گیری بکەی تەنانەت ئەگەر یەک دوو پێشەکیش کەمبێ، دەتوانی بەجۆرێ بیخەیە ڕوو وەک ئەوەی بڵێی دژبەرەکەشت ئەوەی قبووڵکردوە و تۆش دەرەنجام گیری دەکەی..

## (٢١)

# «بە بەڵگەی هەڵبەستراوەوە بەرەوڕووی بەڵگەکانی بوەستەوە»

کاتێک دژبەرەکەت بەڵگەی سادە و ساکاری ڕاست دەخاتە ڕوو تۆش توانیت دەستی بخوێنیتەوە و دڵنیا دەبی کە بەئاسانی دەتوانی لاوازی و هەڵەی بەڵگەکان بخەیتەڕوو لەو ڕوانگەیەوە ڕەتی بکەیتەوە، پێویستە تۆش بە بەڵگەی پێچەوانە و بەهەمان ئەندازەی سادە و ساکار بەرەنگاری ببیەوە و بەوشێوەیە لەشەڕی ئەو دەربازت دەبێ.

چونکە کەڵکەڵەی تۆ سەرکەوتنە نەک دەرخستنی ڕاستی، ئەگەر بۆ نموونە بەڵگەیەک بخەیتەڕوو تەنیا لە ڕوانگەی تۆوە ڕاست بێ بەشێوەیەکی گشتی ئەوە ڕێگەیەکی کورتترە، هەڵبەت ئەگەر بە تێڕوانینێکی کراوە بێت.

## (٢٢)

## «داوای سەلماندن لە بێژەر بکە»

ئەگەر دژبەرەکەت داوای لێکردی شتێک قبووڵ بکەی کە بابەتی کێشەلەسەر بەوهۆیەوە بەرهەمدار دەبێ و زیانی تۆی تێدایە، دەبێ خۆت لەوشتە نەدەی و رەتی بکەیەوە.

چونکە ئەو و تەواوی ئامادەبوان بابەتەکە لەشێوەی بابەتی بەردەست تێکەڵ دەکەن و لێکی جیا ناکەنەوە، بەو شێوەیە دەتوانی ئەو لە بەهێزترین بەڵگەکانی دابماڵی.

## (٢٣)

## «تووشی زیادەڕەوی بکە»

دژایەتی و پێکهەڵشاخان وا لە مرۆڤ دەکات لەکاتی قسەکردندا تووشی زیادەڕەوی ببێ. لە ڕێی دژایەتی و ڕووبەڕوو وەستانەوەی دەتوانی وایلێبکەی کە قسەیەک بەدەر لە ڕاستی و سنووری دیاریکراو دەربپەڕێنێ.

لەهەر دۆخێکدا لەناو ئەو چوارچێوەیەدا خۆی لەخۆیدا ڕاستییە، کاتێ تۆ ئەو قسە زیادەڕەویە ڕەت بکەیەوە وادێتە بەرچاو کە قسەی سەرەکی ئەوت ڕەت کردبێتەوە.

لەبەرامبەردا دەبێ ئاگات لەوە بێ کە لەڕێچکە لادەرەکەی ئەوەوە نەکشێی و تۆش لە قسەکانی خۆتدا تووشی زیادەڕەوی نەبی و پەرەی پێ نەدەی.

زۆربەی کاتەکان دژبەرەکەت بێ پەردە هەوڵ دەدا بێ ئەوەی ئاگات لەخۆت بێ پەرەی پێبدەی، دەبێ لەو حاڵەتەدا ڕێی لێبگری و ئەو بگێڕیتەوە ئەو سنوورەی کە بۆت کێشاوە «قسەی من تەنیا ئەوەبوو، تەواو».

# (٢٤)

# «پێوەری ناڕاست بخەڕوو»

دژبەرەکەت کێشـــەکە دەخـــاتەڕوو، تـــۆش بەدەرەنجـــامی هەڵە و بەلارێدا بردنی مەبەستی ئەو بـابەتە بەرەو ئاقـارێ دیـکە دەبەی، کە هەرگیـــز دژبەرەکەت مەبەســـتی ئەو شـــتە نەبـــووە و بیـــری بەلایـــدا نەچووە، خۆ باشتروایە ئەگەر بابەتەکە مەترسیدار و ناماقوڵیش بێ.

لەو کـــاتەدا وادەردەکەوێ کە کێشـــەکەی ئەو لەگەڵ کێشـــەگەلی دیکە جیاوازە، یـان لەگەڵ خـودی خـۆی یـان جـۆری ڕاسـتی مـایەی قبووڵ جیاوازە.

جـــا لەبەر ئەوە وادێـــتە بەرچـــاو کە ئەو کێشـــەیە بەشـــێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕەت دەکرێتەوە.

## (٢٥)

## «نموونە پێچەوانە بهێنەوە»

ئەو تەڵەکەیە بریتییە لەجۆرێک بەلاڕێدابردن، لە ڕێگەی نموونەی پێچەوانەوە.

بەڵگە هێنانەوە پێویستی بە نموونەگەلی زۆر هەیە تا کێشەیەک وەک کێشەی گشتی یان سەرتاسەری بسەلمێنێ.

بەڵام بە لاڕێدابردنی باسێک بۆ لەکەدارکردنی کێشەیەک تەنیا پێویستی بە نموونە هەیە کە ئەو کێشە باوەڕی پێدەکرێ.

ئەو شێوازی گفتوگۆیە بە (هێنانەوەی نموونەی دژ) بەناوبانگە بۆ نموونە: «سەرجەمی ئالیک خۆرەکان قۆچدارن» ئەوە کێشەیە کە وشتر لەو یاسایە بەدەرە و ئەو گیاندارە لەگرینگی ئەو بۆچوونە کەمدەکاتەوە و لەباری دەبا.

نموونەی دژ لەکاتێکدایە کە دەیانەوێ هەقیقەتێکی سەرتاسەری بێ ئیعتیبار و متمانە بکەن، بەڵام بۆی هەیە هەڵەش هەبێ، کاتێ دژبەرەکەت ئەو تەڵەکەیە بەکار دێنێ، دەبێ بزانی:

١- ئایا ئەو نموونەی هێناویەتییەوە واقیعی و ڕاستە یان نا. هەندێ بابەتی وا هەیە کە تاکە ڕێگە چارەی سەرەکی ئەوەیە کە بزانین ئەسڵی ئەو بابەتەی باس دەکرێ ڕاست نییە.

بۆ نموونە: زۆربەی موعجیزەکان (پەرجوو)، چیرۆکەکانی لەمەڕ ڕۆحەکان و جنۆکە و هاوشێوەکانی.

٢- ئایا {ئەو نموونەیە]ی پێشوو کە بەو شێوەیە خراوەتەڕوو دەگونجێ یان نا، بۆیە لەوانەیە تەنیا لە ڕواڵەتدا وەها بێ و لەڕاستیدا ڕێگەچارەی ئەو بابەتە پەی بردن بێ بەبوونی جیاوازی لێک هەڵاواردنە وردەکان.

٣- ئایا ئەو {نموونە]یە لەگەڵ دەرەنجامی بەدەستهاتوو جیاوازی هەیە یان نییە.

بۆیە لەوانەیە ئەو جیاوازییەش تەنیا شتێکی ڕواڵەتی بێ.

# (٢٦)

# «دۆخەکە لەقازانجی خۆت بگۆڕە»

جۆرێــک لە دەربڕینــی هۆشــمەندانە بــریتییە لە هەڵگێــڕانەوەی یــارییەکە لەقــازانجی خــۆت کە بەهــۆی ئەو بەڵگــانەوە بەســەر دژبەرەکەتدا سەردەکەوی.

بۆنمـوونە ئەو دەڵێـت: «فـڵانەکەس منـداڵە و دەبـێ بەئـارەزووی ئەو بێیەوە»، تۆ یەکسەر لەوەڵامدا دەڵێی «ڕێک بەهەمان هۆکار کە منداڵە، دەبێ تەنبێی بکەم بەدەر لەو چارەسەرە، حاڵەتە خراپەکانی واز لێناهێنێ!».

## (٢٧)

## «تووڕەبوون نیشانەی لاوازییە»

ئەگەر بەتەواوی سەرسامییەوە دەبینی کە دژبەرەکەت لە بەڵگەیەک تووڕەبووە، دەبێ بە شەوق و زەوقەوە پێداگری زیاتر لەسەر بەڵگەکانت بکەی.

نەک تەنیا بەو هۆکارەی کە تووڕەکردنی ئەو کارێکی باشە، بەڵکو چونکە دەکرێ هەست بکەین کە پەنجەت خستۆتە سەرخاڵی لاوازی و ئێستا لەهەر کاتێکی دیکە زیاتر لە بەرانبەر پەلامار و هێرشی تۆ هەست بە تێکشکان دەکات.

# (٢٨)

# «قەناعەت بە ئامادەبووان بکە نەک بە دژبەر»

ئەو تەڵەکەیە بەتایبەتی کاتێ کردەیی دەبێ کە دوو کەسی تێگەیشتوو لەبەرچاوی خەڵک باس و گفتوگۆ دەکەن.

ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی ڕەتکردنەوەت پێنییە، دەتوانی زەمینە بۆ بەڵگەیەک خۆش بکەی کە ڕوو لە ئامادەبوان بێ. بەواتایەکی دیکە دەتوانی دژایەتییەکی بێ بنەمای بکەی کە تەنیا ئەهلی هونەر پەی بە بێ بایەخیەکەی بەرێ.

ئەگەرچی دژبەرەکەت ئەهلی هونەرە، بەڵام ئامادەبوان ئەهل نین، بەو پێیە و لە ڕوانگەی ئەوانەوە دژبەرەکەت سەرکەوتوویە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوت خستبێتە دۆخێکی گاڵتە جارییەوە.

خەڵک ئامادەیە پێبکەنن و پێکەنینەکەش لەبەرژەوەندی تۆیە. دژبەرەکەت بۆ ئەوەی بێهودەبوونی دژایەتی تۆ پێشانبدا دەبێ ڕوونکردنەوەیەک بدات و لەسەر بنەما و پرەنسیپی لقەکانی مەعریفەتی جێی مەبەست یان بنەماکانی بابەتی جێ مەبەست بکات و خەڵکیش ئامادەی بیستنی ئەو ئاماژە و قسانەیان نییە.

بۆ نموونە: دژبەرەکەت دەڵێ لە سەرەتادا زنجیرە کێوەکان گرانێت و ڕەگەزەکانی دیکەی پێکهێنەریان بەهۆی پلەی گەرمی زۆرەوە لەشێوەی شلدا تواونەتەوە و پلەی گەرمییەکەشی گەیشتۆتە

٤٨٠ پلەی فارنهایت، کاتێکیش بوو بە زنجیرەشاخ ئاوی دەریا دایپۆشیوە.

تۆش لەوەلامدا دەڵێی: لەو پلەیەدا و لە ڕاستیدا پلەیەکی کەمتر واتا لە ٢١٢ پلەی فارنهایت دەریای کوڵاندوەو بەشێوەی هەڵم بە ئاسماندا بەرز بۆتەوە.

ئامادەبوان بەو قسەیەت پێ دەکەنن، بۆ ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکەت دژبەرەکەت دەبێ ئەوە بخاتە ڕوو کە خاڵی کوڵان نەک تەنیا لە پلەی گەرمیدا بەڵکو پەیوەندی بە پەستان و فشاری هەواوە هەیە.

سەرەڕای ئەوەی نزیکەی نیوەی ئاوی دەریا ببێتە هەڵم، ئەو فشارە بە ئەندازەیەک هەڵدەکشێ کە باقی ئەوان تەنانەت لە پلەی گەرمی ٤٨٠ پلە دا ناکوڵێت، بەڵام ئەو لەدەرخستنی ئەو ڕاستییە دادەمێنێ لەبەر ئەوەی ڕوونکردنەوەی بابەتێک بۆ کەسانێ کە شارەزاییان لە فیزیا نییە، پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە.

## (٢٩)

## «ئاراستەی باسەکە بگۆڕە»

ئەگەر زانیت خەریکە دەدۆڕێی، دەتوانی ئاراستەی باسەکە بگۆڕی واتا دەتوانی بەخێرایی بابەتی قسەکردنەکە بگۆڕی و باسەکە ببەیە سەرشتێکی دیکە.

بەشێوەیەک وەک ئەوەی پەیوەندی بەو بابەتەوە هەبێ کە باستان کردووە و هەندێ بەڵگەش بە دژی دژبەرەکەت پەیدا بکە. ئەگەر بەلارێدا بردنی ئاراستەی باسەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بابەتی پێشترەوە هەبێ، دەتوانی بەبێ دواکەوتن ئەو کارە بکەیت، بەڵام ئەگەر بابەتی کۆن و تازە هیچ پەیوەندیان بەیەکترەوە نەبوو، تەنیا لەپیناو بەرپەرچ دانەوەی دژبەر بەکار هات جۆرێکە لە بێ شەرمی و بێ ئابڕوویی.

بۆ نموونە: من پشتگیری سیستەمی سیاسی چین دەکەم کە لەوێدا شتێک نییە بەناوی شەرافەتی پاشماوەیی و پشتاوپشت، پلە و پۆستەکانی ئەو وڵاتە تەنیا بە کەسانێک دەبەخشرێ کە لە ئەزموونە ژێرچاودێرییەکانیان سەربەرز هاتبنەدەر، دژبەرەکەم دەڵێ: کە خوێندنی ڕاست وەک هەبوونی ئەسڵو نەسەب و نەجیب زادەیی (کە سەبارەت بەوە تێڕوانینی باشە). مرۆڤ هێندە بۆ وەرگرتنی

پله و پۆست ئامادە ناکا، ئێمە لەسەر ئەو بابەتە گفتوگۆمان کرد و ئەو تێک شکا.

دوایی ئاراستەی باسەکەی گۆڕی و گوتی: (لەچین تەواوی بەرپرسەکان بە چەرخ و فەلەک سزادەدرێن، ئەو بابەتەش بەزیادەڕەوی لەخواردنەوەی چادا پەیوەستە و بە هۆکاری هەردوو بابەتەکە ڕەخنەی لەچین گرت.

ئەگەر ئەو بابەتەم درێژە پێدابا ئەو سەرکەوتنەی پێشتر بەدەستم هێنابوو لەدەستم دەدا.

بەلاڕێدا بردنی ئاراستەی باس بێشەرمی و بێ ئابڕوویی دەوێ بەمەرجێ ئەگەر هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتە سەرەکییەکەوە نەبێ.

بۆ نموونە: نارازایەتییەکانی وەکو «ڕاست و لەهەمان کاتدا گوتن» بهێنە گۆڕێ، بۆیە لەوکاتانەدا بەڵگە تاڕادەیەک دەبێتە کەسی، لەو جۆرەیاندا کە لەبەشی کۆتایدا باسی لێوە دەکەین کاتێ دەگژیەکڕاچونی خەڵکی ئاسایی دەبینین بەسرووشتی بوونی ئەو فێڵە پەی دەبەین.

ئەگەر یەکێ لە لایەنەکان ڕەخنەیەکی شەخسی لە کەسی بەرانبەر بگرێ، لایەنی بەرانبەر لەجیاتی ئەوەی لە پلەی وەڵامدانەوە ئەو ڕەخنەیە ڕەتبکاتەوە ئەو لەشوێنی خۆی بەجێی دێڵێ و ئەویان قبووڵ دەکا و بەڕەخنەی هاوشێوە وەڵامی دژبەرەکەی دەداتەوە.

ئەسکیپیۆش لەکاتی هێرش بردنە سەر کارتاژییەکان نەک لە ئیتالیا بەڵکو لە ئەفریقیا پەیڕەوی ئەو تەڵەکەیان کرد.

بۆی هەیە لە جەنگدا ئەو جۆرە چالاکییە لادەریانە بەکەڵک بن بەڵام لە مناقەشە و پێکهەڵشاخاندا شتێکی باش نییە چونکە نابێتە لەمپەری بەر هێرشەکان و ئامادەبوانیش تا شیرینترین و دزێوترین قسە لە دوو کەس دەبیستن ئەو تەڵەکەیە تەنیا لەکاتی ناچاریدا بەکار بهێنرێ.

{لەگەڵ تەڵەکەی ١٨ بەراوردی بکە]

## (٣٠)

## «لەجیاتی بەڵگە پشت بە سەرچاوە ببەستە»

ئەو تەڵەکەیە بریتییە لە پشت بەستن بە ژێدەر لەجیاتی بەڵگە، بە کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەی شیاو و ئاستی زانستی دژبەر. بەگوتەی «سنکا» هەر مرۆڤێکی ژێر باوەڕ بەسەر پشتبەستن بەهێزدا پەسەند دەکات.

لەبەر ئەوە ئەگەر پێگەی تۆ هاوسەنگی رای ژێدەر بێت کە دژبەرەکەت ڕێزی لێدەگرێ بەکارهێنانی ئەو تەڵەکەیە ئاسانە.

هەتا توانا و لێهاتوویی دژبەرەکەت سنووردارتر بێ ژێدەرگەلی زیاتری بەلاوە گرینگە، بەڵام ئەگەر توانا و لێهاتوویی زۆر بوو سەرچاوەی کەم پەسەند و قبووڵ دەکات و تەنانەت لەوانەیە متمانە و باوەڕی بە سەرچاوەکانیش نەبێ بەڵکوو ژێدەری پسپۆڕان لێوڕێژبێ لە زانست و زانیاری یا هونەر یا پیشەیەک کە سەرڕشتەی نییە قبووڵبکات.

لەو حاڵەتەدا بە چاوێکی گومانـاوی لەو بابەتە دەڕوانێ بە پێچەوانەوە خەڵکی ئاسایی ڕێزێکی زۆر لە سەرجەم پسپۆڕان دەگرن، ئەوان نازانن کە هەر کەسێک لەڕێی پیشەکەیەوە بژێوی ژیانی خۆی دەستەبەر دەکا و ئەو پیشەیان نەک لەبەر خاتری

خۆیان بەڵکوو لەبەر مووچەکەیان خۆشدەوێ، هەروەها ئەوە نازانن کە مامۆستایان زۆر بە دەگمەن بەسەر بابەتی وانەکەی خۆیاندا زاڵن، بۆیە ئەگەر بەوشێوە دەشێ و ناشێیە ئەوە بخوێننەوە لە زۆربەی کاتەکانی دیکەدا کاتیان بۆ وانەگوتنەوە نییە.

خەڵکی ئاسایی ڕێز لە سەرچاوەگەلی دیکەش دەگرن ئەوانە ئەگەر گونجاوترین ژێدەرت لەبەر دەستدا نەبوو دەتوانی شتێکی دیکەی ئەوان دەستنیشان بکەی؛ دەتوانی بابەتێکی دیکە بەمانایەکی دیکە لەسەرچاوەدا هاتووە وەک نموونە بۆی بهێنییەوە.

دیارە دژبەرەکەت زۆرترین بڕوای بە سەرچاوە هەیە، هەرچەندە لێشی تێناگا، نەخوێندەوارەکان زۆر ڕێز لەو وشە یۆنانیانە دەگرن کە لەکاتی شەڕکردندا بەکار دێن، هەروەک لەکاتی پێویستدا نەک تەنیا دەتوانی وشە و مانای مەبەستت هەڵگێڕییەوە و بەڵکو دەتوانی قسەکانی ئەوان پێچەوانە بکەیەوە یان شتێکی تەوا و بێمانا بگوازیەوە.

دیارە دژبەرەکەت هیچ کتێبێکی لەبەردەستدا نییە و تەنانەت بەدەر لەو حاڵەتەش ناتوانێ کەڵکی لێوەربگرێ جوانترین نموونەش لەو ڕووەوە هەمان قەشەی فەرەنسییە چونکە داوایان لێکرد وەک تەوای خەڵکی دیکەی سەرشەقامەکە پیادەڕۆی بەردەرگاکەی خۆی بەردچن بکا، ئەویش دەیویست خۆی لەوکارە ببوێرێ، شتێکی خوێندەوە گویە لە کتێبی پیرۆزەوە دەری هێناوە: «بەداخەوە کە

دەترسن، من نامەوێ بترسن» ئەوە بۆکارمەندانی شارەوانی بەس بوو کەوازی لێبهێنن.

دەتوانی باوەڕی رای گشتی وەک زێدەر بەکاریەری، بۆیە زۆربەی خەڵکی هاوبیری ئەرستۆن کە دەڵێن ئەو شتەی زۆرینە باوەڕی پێی هێنا ئەو شتە هەیە.

سەرەڕای ئەوەی کە خەڵکی هیچ گومانیان لەوە نییە کە باوەڕێک سەرەڕای ئەوەی گەمژانە و دەبەنگانە بێت لەهەمان کاتدا باوەڕیان پێیەتی و یەکسەریش پەسەندی دەکەن نموونە و سەرمەشقی خەڵکی دیکە کاریان تێدەکات و دەستەمۆی دەبن.

ئەوان زیاتر لەو مەڕانە دەچن کە بەرانی پێشڕەویان بەرەو هەرلا ملبنێ وەدوای دەکەون ئەوان زیاتر لەوەی بیر بکەنەوە دەمرن.

زۆرم بەلاوە سەیرە کە (باوەڕی گشتی) هێندە بەلای خەڵکییەوە گرینگە لەوانە بوو ئەزموونی شەخسی ئەوان پێیان بڵێ کە قبووڵکردن و شوێن کەوتنی ئەو بیر و باوەڕە تەواو دەبەنگانە و چاولێکەرییە و دەزانێ بەڵام ئامادە نییە ئەو شتە بەخەڵکی دیکە بڵێ بۆیە لەهەر جۆرە خۆناسینێک بێ بەهرەن.

تەنیا تایبەتەکانن کە هاودەنگ لەگەڵ ئەفلاتوون دەڵێن: (خەڵکی تامەزرۆی شتی زۆرن لۆمە و سەرزەنشت کردنیان کارێکی ئاسان نییە).

ئەگەر بمانەوێ لێبڕاوانە قسە بکەین دەبێ بڵێین کە زۆرینە لەسەر بیر و باوەڕی ڕاست نییە، لە ڕاستیدا ئەو بابەتە دەلالەت لە ڕاستی باوەڕەکەش ناکات.

ئەوانەی کە باوەڕیان بەوشتە هەیە دەبێ ڕاست بزانن:

١- تێپەڕبوونی کات هێزی سەلماندن و ڕاستی باوەڕی ئەوان ڕەتدەکاتەوە، بەدەر لەو حاڵەتە تەواوی هەڵە مێژووییەکان تەواوی بیر و باوەڕی خەڵکی عەوامی کۆمەڵگە باوەڕیان پێیان بوە و بەڕاستیان زانیوە، دووبارە دەبێتەوە بۆ نموونە: دەبوو سیستەمی (بەتلمیوسی) زیندوو بکرێتەوە، یان مەزهەبی کاتۆلیکی لە تەواوی دەوڵەتانی پرۆتستان بەفەرمی بناسرێ. ئەوان دەبێ لەوە دڵنیا بن.

٢- مەودای شوێنی کاریگەری هاوسەنگی هەیە، بەدەر لەو حاڵەتە سەرجەمی باوەڕە تایبەتەکان کێشە بۆ پەیڕەوە ئاینیەکانی بوودایی، مەسیحی و ئیسلامی دروست دەکەن.

کاتێک لە بابەتەکە ورد دەبینەوە باوەڕ بە مانا گشتییەکەی باوەڕی دوو یان سێ کەسە، ئەگەر تێبگەین چۆن باوەڕی گشتی سەرچاوەی گرتووە، یەکسەر باوەڕ بەوە دەکەین.

دەبێ بزانین کە لە حاڵەتی یەکەمدا دوو یان سێ کەس ئەو باوەڕەیان پەسەند کردووە، یان بڵاویان کردۆتەوە و پێداگریان لەسەر ئەوە کە ئەو خەڵکەی هێندە لەژێر کاریگەری ئەواندایە و گرینگیان پێ دەدەن لەوە دڵنیا بوون کە ئەو چەند کەسە بە تەواوی شەن و کەوی باوەڕەکەیان کردووە ئینجا دوو سێ کەسی

دیکە کە دێنە قەناعەت کە ئەوانی پێشتر لەسەر هەق و ڕاستین ئەوانیش مایەی متمانەی خەڵکێکی دیکەی دەور و بەریانن.

ئەو کەسە دەبەنگ و تەمبەڵانەش کەتوانای بیرکردنەوەیان نەبووە و پێیان وا بووە ئەوانی پێشتر لەجیاتی ئەوانیش بیریان کردۆتەوە و باشتروایە باوەڕ بێنن و پێویست ناکا زەحمەتی بیرکردنەوە و توێژینەوە بدەنە بەر خۆیان.

بەو شێوەیە ژمارەی ئەو باوەڕدارە سادە و ساویلکانە ڕۆژ بەڕۆژ هەڵکشا و بەو هۆیەوە کە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی پەیڕەو و لایەنگریان لێکردوون باوەڕدارەکان ڕۆژ بەڕۆژ زیادیان کردووە ئەوەشیان بۆ ئەو هۆکارە گەڕاندەوە کە ئەوە باوەڕی گشتییە. خەڵکی دیکەش ناچار بوون مل بۆ ئەو باوەڕە گشتییە بدەن، تا خەڵکی کۆمەڵگەکەیان ئەوان بە کەسانی بێ ئابڕوو سەرکێش کە لارییان لە قبوولکردنی باوەڕی گشتی هەیە نەژمێریت و خەڵکی نەڵێن ئەوانە ئەوەندە دەبەنگن خۆیان لە خەڵکی دەورووبەر پێ ڕاستتر و ئاقڵترە.

کاتێک بیر و باوەڕێک دەگاتە ئەو قۆناغە، لایەنگری لەو باوەڕە لە باوەڕەوە دەبێتە ئەرک و دەبێ قبووڵ بکرێ، لێرە بەدوا ئەو ژمارە کەمەی کە ڕای جیاوازیان هەیە ناچارن دەمی خۆیان داخەن.

ئەوانەش کە مافی قسەکردن و وتاردانیان هەیە بەهیچ شێوەیەک خاوەنی ڕای خۆیان نین و ڕێک و ڕاست باوەڕی خەڵکی دیکە کاوێژ دەکەنەوە.

سەرەڕای ئەوەش بە دەمارگرژی و توندڕەوی زیاترەوە داکۆکی لەو بـاوەڕە سـەپاوەیان دەکەن باوەڕیـان بەڕای جیـاواز نیـیە و ئەندێشەی پێچەوانە بە ڕووقایمی و بێ ئابڕوویی دەزانن و نەفـرەت لە کەسانی ڕاسەربەخۆ دەکەن.

قسـەی کـورتی ئەو ژمـارە زۆر کەمەی کە دەتـوانن بیـربکەنەوە هەر مرۆڤێـک دەیەوێ بیـر و بـاوەڕێکی هەبێ لەبەر ئەوە چ رایەکـی دیـکە دەمێنێـتەوە کە بـاوەڕێکی ئامـادەکراو و بەردەسـت لەخەڵکـی دیـکە وەرگـرن، لەجیـاتی ئەوەی بـاوەڕێکی سـەربەخۆ بـۆ خۆیـان هەڵبژێرن؟ ئێسـتا کە بـارودۆخەکە ئـاوایە بـاوەڕی تەنـانەت سـەدان ملیۆن کەس چ نرخ و بەهایەکی هەیە؟

ئەو بـاوەڕە بەدەر لەواقیعیەتـی مێژوویـی نیـیە، کە سـەد مێژوونووس لەسەریان نووسیبێ و ئەوە دیـاربێ کە هەموویـان لەبەر یەکتریـان نووسـیبێتەوە، لەکۆتاییـدا سـەرچاوەی هەموویـان یەک کەسە، ئەوەشیان ئاوایە:

ئەوەی دەیڵـێم، ئەوەی تـۆ دەیڵێـی، سـەرەنجام ئەوەی خەڵکـی دیکە دەیڵێ، هەمووی هیچ نییە جگە لە کۆمەڵێک بانگەشە:

Deco egaa, tu dicis, sed deni qucdixit ot illc,

Dictoque post toties, nilinisi dicta vides

سەرەڕای ئەوەش لە قسەکردن لەگەڵ خەڵکی ئاسایی دەتـوانین پیرۆزیەکانی خەڵکی وەک جۆرێک لەسەرچاوە بەکار بێنـین، چـونکە

جوان دیارە کاتێ دوو کەس لەسەر بابەتێک دەکەونە کێشە و هەردووکیان ئەو سەرچاوەیە وەک چەکی بەرەنگار بوونەوەی ئەوی دیکە بەکار دێنێ، ئەگەر کەسێکی دیار و بەرچاو لەگەڵ ئەوان ڕووبەڕوو بێ ئەقڵانەترین هەڵوێست ئەوەیە بەو چەکەوە لەڕوویان بوەستێتەوە.

بەشێوەیەک کەڵک لە سەرچاوە وەربگرێ کە خاڵی لاوازی دژبەرەکەی پێبگرێ و کاریگەری بکاتە سەر، بۆیە بەپێی ئەو ناسنامە خەڵکی ڕەشۆکی ڕێک ئەوەندەی زیگفرید (hotny-hided) لەبەرانبەر هەر بەڵگەیەکی عەقڵانیدا بێدەربەستە و بەجۆرەها لاوازی بێ تواناییدا دەتلێتەوە توانای بیرکردنەوە و بڕیاردانی نییە.

لە دادگاکان ڕێک ئەو ڕواڵەتە مەبەستم حوکمەکان و سەرچاوە و ژێدەرەکانە کە مافناسان دایانڕشتووە.

دادوەریکردن بریتییە لەوەی دۆزینەوەی ئەوەی کەچ یاسا یان ژێدەرێک پەیوەندی بە پەروەندەی پەیوەندی دارەوە، ئەگەر پەروەندەی جێ مەبەست و یاسای باو لەگەڵ یەکتر تەبا و هاوسەنگ نەبن دەتوانی ئەوان لەکاتی پێویستدا بەشێوەیەک هەڵگێڕیەوە و بەلاڕێدا ببەی کە گونجاو بێتە بەرچاو.

هەڵبەت ئەگەری پێچەوانەی ئەوەش زۆرە {واتا ئەگەر پەروەندەی بەردەست و یاسایەکە بەتەواوی هاوسەنگ و تەبا بوون، دەتوانی بەشێوەیەک هەڵیگێڕیەوە بەلاڕێدا ببەی کە نەگونجاو دەربکەوێ.]

# (٣١)

# «ئەو بابەتە لەسەرووی تێگەیشتنی منەوەیە!»

ئەگەر دەزانیت لەبەرانبەر بەڵگە بەهێزەکانی دژبەرەکەت وەڵامێکت پێ نییە دەتوانی بە پارێز و دەرفەتێکی جوان کە توانا و دەسەڵاتت نییە بڕیاری کۆتایی لەو بارەیەوە بدەی: «ئەو قسەیەی دەیکەیت لەسەرووی توانای تێگەیشتنی منەوەیە، بۆی هەیە تەواوی ڕاستبێ بەڵام ناتوانم لێی تێبگەم بۆیە ناتوانم هیچ ڕوونکردنەوەیەک لەو بارەوە بدەم» بەو شێوەیە لەنێو ئەو خەڵکەدا کە لەلای ئەوان ناوبانگێکی باشت هەیە بە ئامارەیەکی جوان دژبەرەکەت و ئەوانی دیکە تێدەگەیەنی کە قسەی ئەو پوچ و بێ مانایە.

کاتێ ڕەخنەی (کانت) بڵاو کرایەوە یان بە واتایەکی دیکە کاتێ هەڵایەکی دیکەی گەورەی لە جیهان نایەوە، زۆر لە مامۆستایانی مەکتەبی (ئیلتیقاتی) کۆن ڕایان گەیاند کە ئەوان لێی تێناگەن و دەرکی پێ ناکەن، بە گومانی ئەوەی دەستەپاچەیی و بێ توانایی ئەوان لە بابەتەکە دوور دەکەوێتەوە.

بەڵام کاتێ پەیڕەوانی مەکتەبی تازە پەنجەیان خستە سەر ڕاستی بابەتەکە و نیشانیاندان کە هەر بەڕاستی لە تێگەیشتنی ئەو تێزە بەپێزەدا کۆڵەوار و دەستە وەستان بوون.

ئیتر ئەومامۆستایانە زۆر تووڕە و پەست بوون، ئەو تەڵەکەیە تەنیا کاتێ دەتوانی بەکاربەری کە دڵنیای لەوەی ئامادەبووان رایەکی ئەرێنیان لەسەر تۆ هەیە بەبەراورد لەگەڵ دژبەرەکەت.

بەواتایەکی دیکە ئەو تەڵەکەیە نموونەیەکە لە نموونەی پێشتر جۆری پشتگیری کردن و بەڕاست زانین تەواو مەبەستداری سەرچاوەی خۆی لەشوێنی هێنانەوەی بەڵگە.

بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو تەڵەکەیە دەبێ بڵێین: «داوای لێبووردنم هەیە، بەڵام بەو هەموو هۆش و زیرەکییە کە بەڕێزت هەتانە و بەئاسانی دەتوانی دەرک بەهەموو شتێک بکەی و تێی بگەی وە لەوانەیە من مەبەستەکەم بەتەواوی دەرک نەکردبێ.» ئیتر دەبێ بەشێوەیەک بەشان و پیلی بابەتەکە هەڵبڵێی و پڵپڵە و لەرزانەی پێوەنێی کە دژبەرەکەت بێتە سەر ئەو دەرەنجامەی کە تاوانی خراپ گەیاندن لە خۆیەتی. بەو شێوەیە بەرپەرچی هێرشی ئەو دەدەیتەوە.

ئەو زۆر بە ئەدەبەوە دەیویست پێی بڵێی کە تۆ هەڵیت و پەڵیت دەڵێیت و تۆش زۆر بە ئەدەبەوە پێی دەڵێی کە ئەو گەمژە و دەبەنگە.

## (٣٢)

# «سروشتی ئەو لە وتەیەکی نەفرەت ئامێزدا پۆلبەندی بکە»

ئەگەر لەگەڵ گەنگەشـەیەک ڕووبەڕوو بـووی، کـورتترین ڕێـگە بـۆ دەربـاز بـوون لەشـەڕی ئەو ئەوەیە یـان بەهەرشـێوەیەک گومـان خستنەسـەری هەیە کە بـریتییە لە پـۆلێنکردنی ئەو لە گـوتەیەکی نەفرەت ئامێزدا.

تەنانەت ئەگەر ئەو پەیوەستکردنە ڕواڵەتی و شل بێت.

بـۆ نمـوونە: دەتـوانی بڵێـی «ئەوە مـانویتە» یـان «ئەو خواردنەوەیە ئاریۆسە» یـان «یـانەی پلاگیـۆس» یـان «ئایـدیالیزم» یان «نەی ئەسپینۆزا» یان «یەکێتـی وجـود» یـان «یـانەی بـراون» یان «سرووشتگەرایی» یـان «کـوفر» یـان «عەقڵگەرایـی»، «بـاوەڕ بەبوونی ئەڕواح» عیرفان و چەندانی دیکەی لەو شێوە.

بەخستنەڕووی ئەو نارەزایەتییە و هاوشێوەی ئەوان.

١- گەنگەشەی مایەی نیـاز لەگەڵ گـوتەی گـوتراو هاوسـەنگە یـان لانـی کەم لەگەڵـی دەگـونجێ، بە واتـایەکی دیـکە هـاوار دەکەی «ئـۆو، پێشتر من ئەوەم بیستووە».

٢- ئەوە کە سیستەمی مایەی ئامـاژە تەواو پـووچەڵ کـراوەتەوە و هـیچ ڕاستییەکی تێدا نییە.

## (٣٣)

## «بەقسە ڕاستگۆیە، نەک بەکردوە»

«بەقسە زۆر باشە، بەڵام بە کردەوە بێکەڵکە و بۆهیچ نابێ»

لەو سەفسەتەیەدا پێشەکی قبووڵ دەکەی بەڵام دەرەنجام ڕەت دەکەیەوە، بە پێچەوانەی بنەمایەکی دیار و بەنێوبانگ.

ئەو گەنگەشەیە لەسەر بنەمای مەحاڵ دامەزراوە: هەرچی بەقسە ڕاستە دەبێ بە کردەیی بکرێ.

بەڵام ئەگەر کردەیی نەبێ لە شوێنێکی قسەکەدا کێشەیەک هەیە.

شتێک نادیدە گیراوە و ڕێکنەخراوە، یان خراوەتە بەرچاو دەرەنجام هەرچی لە کردەوەدا ناڕاست بێ لە گوتاریشدا ناڕاستە.

## (٣٤)

## «نەهێڵێ خۆی لە گێچەڵ دەرباز بکا»

کاتێک پرسیار یان بەڵگەیەک دەخەیەڕوو، دژبەرەکەت وەڵامێکی یەکسەرەی پێ نییە، بەڵکو بە پرسیاری بەرانبەر یان وەڵامێکی نادروست بیەوێ خۆی بدزێتەوە.

(یان گەنگەشەیەک دێنێتە پێشەوە کە هیچ پەیوەندیەکی بە بابەتەکەوە نییە بەشێوەیەکی گشتی هەوڵ دەدا بابەتەکە بگۆڕێ).

ئەو بابەتە نیشانەیەکی دڵنیاکەرەوەیە لەوەی کە دەستت خستۆتە سەر خاڵی لاوازی هەندێجار بێ ئەوەی بەخۆت بزانی، تۆ ئەوت بێدەنگ کردووە.

لەبەرئەوەی دەبێ ئەوەندەی دەتوانی پێداگری بکەی و تەرکیز بکەیتە سەر ئەو خاڵە و ڕێگە نەدەی دژبەرەکەت خۆی لە گێچەڵی تۆ بدزێتەوە، تەنانەت گەر نەشزانی ئەوخاڵە لاوازەی پەنجەت خستۆتەسەری لەڕاستیدا لەکوێیە.

## (٣٥)

## «ئیرادە لە عەقڵ و هۆش کاریگەرترە»

تەڵەکەی دیکە هەیە کە هەرکاتێ بەکردەیی بکرێ، تەواوی تەڵەکەکانی دیکە بەتاڵ دەکاتەوە و پێویستیت پێیان نابێ لەجیاتی ئەوەی بە بەڵگە هێنانەوە کاریگەری بخەیتە سەر عەقڵ و فکری دژبەرەکەت بە ئەندێشەت کاریگەری بخە سەر ئیرادەی ئەو و ئامادەبووانیش کە بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، بەبێ چەند و چۆن دێتە سەرباوەڕی تۆ تەنانەت ئەگەر مایەی پەسەندیش نەبێ.

نیومسقاڵ ئیرادە لە سەد کیلۆ عەقڵ و هۆش کاریگەرترە.

دیارە ئەو کارە تەنیا لە بارودۆخێکی تایبەتدا ئەنجام دەدرێ، ئەگەر بتوانی ئەو هەستە لە دژبەرەکەتدا بەدی بێنی کە باوەڕەکەی ئەگەر ڕاستیەکەی بسەلمێنرێ، یەکسەر بەزیانی تەواو دەبێ ئەوە وەک پەتاتەی گەرم هەست پێ دەکا، کە دەستدانە ئەو کار و باوەڕە هیچ ئەقڵانە نییە.

بۆ نموونە: قەشەیەک لە جۆری باوەڕەکەی (جەزمی فەلسەفی) داکۆکی دەکات، تۆ ئەو ڕاستییە بەو دەسەلمێنی کە ئەو باوەڕە (جەزمی فەلسەفی) لەگەڵ یەکێ لەبنەما بنەڕەتییەکانی کڵێسا ناتەبایە و بەو شێوەیە دەستبەرداری دەبێ.

خاوەن موڵکێک لەو باوەڕەدایە کەڵک وەرگرتن لە ماشێنە جۆراوجۆرەکان لەبواری کشتوکاڵدا بەو شێوەیە کە لەبەریتانیا باوە شێوازێکی زۆر باشە، چونکە کەسێک بەئامێرێکەوە کارگەلی زۆر ئەنجام دەدا.

لێرەدا ئەو تێدەگەیەنی کە بەزوویی گالیسکەکان بەهێزی هەڵمی کاردەکەن و بەو شێوەیە بەهای لەوەڕگەو گەوڕەکانی بەخێوکردنی ئەسپ دادەبەزێ، ئەوکاتە دەبینی چی دەڵێت.

لەو کاتەدا هەرکەسەو هەست دەکا کە دەنگدانی یاسایی چەند گەمژانەیە بەهەمان شێوەیە ئەگەر ئامادەبوان جگە دژبەرەکەت بێنە ناو هەمان گروپ و چین و پیشەوەران کەتۆ ئەندامی تێیدا.

هەرگیز رێگە مەدە کە تێڕوانینی دژبەرەکەت ڕاست و دروست بێ سەرەڕای ئەوەش پێی دەڵێی قسەکەی لەگەڵ بەرژەوەندی هاوبەشی ئامادەبوان ناتەبایە هەموو ئامادەبوان لەو حاڵەتەدا بۆ چوونەکانی ئەو ئەگەر تاڕادەیەکی زۆریش ماقوڵیەتییان تێدابێ کرچ و کاڵ و بێ مانا لێک دەدەنەوە.

لە بەرانبەردا بەڵگەکانی تۆ تەنانەت ئەگەر لەپڕ و لەناکاویش بن راست و دروست و لەجێی خۆی دەژمێرن هەموویان بەدەنگی بەرز پشتیوانی لەتۆ دەکەن.

بەوشێوەیە دژبەرەکەت بەگاڵتەجارییەوە لە مەیدان دەبەزێنی لە ڕاستیدا ئامادەبووان بەشێوەیەکی سروشتی هەموویان دێنە سەر ئەو باوەڕەی کە لەڕووی باوەڕی پتەو بە بابەتەکەتەوە پشتگری تۆ

دەکەن، چونکە هەرشتێک لەبەرژەوەندیمان نەبێ هەمیشە لەبەر چاومان دەبەنگانە دەردەکەوێ.

هۆشی ئێمە ڕووناکی وشک نییە، دەتوانی ئەو تەڵەکەیە بە «لەڕەگەوە هەڵکەندنی دار» بناسێنی.

## (٣٦)

## «دژبەرەکەت گێژبکە «قەشە و ویکفیلّد»»

بەگوتنی فشقایت تەوس و توانج دەتوانی سەر لە دژبەرەکەت بشێوێنی ئەو تەڵەکەیە بە ئاسانی بەدەستەوە دێ، چونکە مرۆڤ پێی وایە کە هەر قسەیەک مانا و ئاماژەی خۆی هەیە:

Gewohnlich glaubt der mensch, wcnn cr nurwortehott.

Esmusse sichdadei dochauch wasdenkenlassen

ئەگەر ئەو لە ناخدا هەست بەلاوازی خۆی بکا سروشتی وابێ بەجۆرێک خۆی نیشان بدا کە شتێک دەبینێ، تێی ناگا، بەواتایەکی دیکە خۆی لە گێلی بدا، بە ئاسانی دەتوانی ڕای خۆتی بەسەردا بسەپێنی.

بۆیە پێویستە قسەگەلێکی دەبەنگانە بکەی کە زۆر زانستی و فەلسەفیانە دەربکەون، چاو و گوێی ئەو کەسە دابخە، دەبێ بڵێی: کە ئەوە بێ چەندوچوونترین وەڵامی پرسیارەکەتە، هەموومان ئەوە دەزانین هەندێ لە فەیلەسوفەکان ئەو تەڵەکەیان لەبەرامبەر خەڵکی ئاسایدا لە بارودۆخی جیاوازدا بەکار هێناوە.

بەڵام چونکە نموونە تازەکان بەرچاو و نەفرەت لێکراون، دەتوانین وەک نموونەی کۆن ئاماژە بە قەشە و ویکفیلّد بکەین.

## (٣٧)

## «بەڵگەیەکی ناڕاست تەواوی بابەتەکە بەتاڵ دەکاتەوە»

ئەگەر دژبەرەکەت لەسەرهەق بوو، بەڵام لەبەختی باشی تۆ بەڵگەیەکی ناڕاستی هێنایەوە بە ئاسانی دەتوانی ڕەتی بکەیەوە دوایی گەنگەشەی ئەوە بکەی کە لەسەر ئەو بنەمایە هەموو بابەتەکەی پووچەڵ و بێمانایە ئەو تەڵەکەیە دەبێ لە تەڵەکە سەرەتاکان بێ.

لە بنەڕەتدا فێڵێکە کە لە ڕێگەیەوە بەڵگەیەکی بە دژی خۆی وەک بەڵگە هێنانەوەی کە خۆی لەخۆیدا دژی گەنگەشەی دژبەر دەوەستێ.

ئەگەر هیچ بەڵگەی ڕاست وەبیری ئەو یان ئامادەبووان نەکەوتەوە تۆبراوە دەبی.

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێک (بەڵگەی وجودی) بۆ سەلماندنی هەبوونی خوا هێنا دەتوانی بە ئاسانی بیبەزێنی چونکە بەڵگەکە بەئاسانی ڕەتدەکرێتەوە بەو شێوەیە کە وەکیل و داکۆکی کارانی ئاشتی پەروەندەی باش و بەهێز لەدەست دەدەن، بۆیە تێدەکۆشن ئەوانە ببەنەوە سەربابەتێک و سەرچاوەیەک کە هیچ سازگاری و تایبەتمەندییەک لەنێواندا نییە، کاتێک کە هیچ سەرچاوە و ژێدەری گونجاویان بەخەیاڵدا نایەت.

## (٣٨)
## «بابەتەکە شەخسەنە بکە، قسەی پووچ و نەشیاو بکە»

هەر کە لەوە تێگەیشتی کە دژبەرەکەت دەستی باڵایە و بۆی هەیە سەرکەوتووبێ و تۆ لەبەردەم شکەستدای، دوا فرت و فێڵ و تەڵەکە بەکاربێنە، واتا بابەتەکە بشەخسێنە، قسەی قۆڕ و بێ مانا بکە.

دەکرێ ئەو تەڵەکەیە بە هەڵەوێژی شەخسی و رووداری ناودێر بکرێ، بەمەبەستی جیاکردنەوەی لەو هەڵەوێژیانەی دیکە کە لەنێو بابەتەکەدا بەشێوەیەکی سادەو بەرچاو لەمەڕ بابەتەکەوە قسەیان لەسەر دەکرێ و خۆیان دەنوێنن، تۆ بەشەخسەنە کردنی بابەتەکە بەتەواوی دەتوانی بەسەر ئەمانەدا زاڵببی و بەقسەی قۆڕ و ئیهانەئامێز بەرانبەر خودی شەخسەکە بیگۆڕی و هێرشی بکەیە سەر.

ئەم هەڵوێستە پەنا بردنە لە کردەی عەقلانییەوە بۆ کردەی جسمانی، واتا عەقڵ دەخرێتە ژێر پێی هێز و کردەیەکی ئاژەڵییە نەک مرۆیانە.

ئەو تەڵەکەیە زۆر بەربڵاوە، چونکە هەموو کەس دەتوانێ ئەنجامی بدا بۆیەش زۆر بەکار دێ. ئێستە پرسیارەکە ئەوەیە لایەنی بەرانبەر دەتوانێ لەبەرانبەر ئەو تەڵەکەیەدا چ هەڵوێستێک بنوێنێ؟ ئەی ئەگەر پەنای بۆ هەمان تەڵەکە برد؟

دیـــارە حـــاڵەتەکە دەگـــاتە حـــاڵەتی کوتەکبـــازی و دوئێـــل و ڕووبەڕووبوونەوە.

ئەگەر پێتـوایە کە تەنیـا ئەوەنـدە بەسـە باسـەکە بەشەخسـەنە نەکەی تووشـــی هەڵەیەکـــی گەورە بوویـــت، کاتێـــک زۆر بە ئـــارامی بەکەسێک دەڵێی کە بەهەڵدا چووە و بیرکردنەوە و قسـەی هەڵەیە ئەو لـێکەوتەیەی دەرەنجـامی هەر مناقسەشـە و دیالۆگێـک بەدی دێ زیاتر لەکاتێـک کە ئیهـانە و بێ ئەدەبـی بەرانبـەر دەکەی ئەو تـوورە دەکەی.

بۆچی وایە؟

بۆیە بەگوتەی هۆبز هەمـوو خۆشـی و شـادییەکی زەینـی بریتییە لەتوانایی بەراوردکردنی خـۆت بەخەڵکـی دیـکە، بەلای مـرۆڤەوە هـیچ شـتێک لە هەسـتی گەورەیـی و خـۆ بەزلزانـی گرینگتـر نیـیە، بە ئـازارترینی ئازارەکـانیش برینـدارکردن و شـکاندنی هەسـتی غـرووری کەسێتی مرۆڤە.

ڕسـتەگەلی هاوشـێوەی (مـردن لە بەدنـاوی خۆشـترە) لێـرەوە سەرچاوە دەگرێ.

مـرۆڤ هەمیشـە لەڕێـگەی بەراوردکردنـی خـۆی لەگەڵ خەڵکـی دیـکە، بەهەر ڕایەک بەڵام بە پـلەی یەکەم لەڕوانـگەی هێـزی فکـری ئاسوودەبێ، لەبەر ئەوە سەرکەوتن لە باسـوخواس و گفتوگۆدا لەهەر شتێکی دیکە زیاتر ناخی مرۆڤ ئاسوودە دەکا.

تامی تالّی شکەستیش لەهەمان شوێنەوە سەرچاوە دەگرێ، سەرەڕای هەرجۆرە مافخواردن و نادادگەریەکیش کە لەنێو قساندا دێتە گۆڕی.

لێرەوە دەبێ دەست بدەینە دوا چەک هەمان دواهەمین تەڵەکە کە ناتوانی بە ئەدەبی وشک و بەتاڵەوە خۆتی لێببوێری.

سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە لەو شوێنە هاریکاری تۆ بکا، سەرەڕای ئەوەی دژبەرت بابەتەکەی بەشخسەنە کردووە.

بە ئارامی وەڵام بدەوە و بڵێ: «ئەوە هیچ پەیوەندی بە بابەتی ئێمەوە نییە».

یەکسەر جڵەوی بابەتەکە بگرە دەست و پێی بسەلمێنە کە ئەو لە هەڵەدایە بێ ئەوەی گوێ بە ئیهانە و قسە ساردەکانی بدەی قسەی (تیمستوکلیس) کە بە (ئاوریبیاس)ی گوت دووبارەی بکەوە و بڵێ: «هێرش بەرە، بەڵام گوێ لەقسەی من بگرە» دیارە هەموو لەو ڕەفتارە کەڵک وەردەگرن.

***

وەک کەرەستەیەکی هۆشیارکەرەوە زۆرترین کاتی گفتەگۆ بۆهەردوو لا بە کەڵکە، چونکە هزری مرۆڤ ڕاست دەکاتەوە و ئەو لە دیدگای تازە وەئاگا دەخاتەوە.

بەڵام دەبێ هەردوو لایەنی گفتوگۆ لەڕووی ئاستی زانستی و مەعریفی تێڕوانینی نوێ هۆشیار بن.

ئەگەر یەکێ لەوێ لە زانست و مەعریفە بەتاڵبێ، قسەی ئەوی دیکە تێناگا، چونکە لەگەڵ ڕەقیبەکەی خۆی لە ئاستێکدا نییە و ئەگەر لەتوانای زەینی بێ بەهرەبێ تووڕە دەبێ و هەڵدەچێ، پەنا بۆ فرتوفێڵی تەفرەدەرانە دەبات و سەرەنجام بێ ئەدەبی دەنوێنێ.

جا لەبەر ئەوە تاکە بنەمای دڵنیاکەرەوە ئەوەیە کە نەک لەگەڵ هەموو کەسێ بەڵکو تەنیا لەگەڵ کەسانێک گفتوگۆ بکەی کە بەتەواوی بیناسیت، دەزانی کە ئاستی هۆش و زەین و عیزەتی نەفسی بەرزە و قسەی سووک و بێ مانا ناکات.

کەسانێ کە پەنا بۆ بەڵگە دەبەن نەک بەشاهیدی درۆ و دەلەسە، سەرەنجام ڕێز لە ڕاستی و هەقیقەت دەگرن و تەنانەت ئەگەر ماف بەلای دژبەرەکەیەوە بێ، بەتامەزرۆییەوە قبووڵی دەکا و ئەوەندەش بەویژدانە کە ئەگەر دژبەرەکەی هەقی هەبێ دان بەهەڵەی خۆیدا دەنێ.

لەوێوە دەگەینە ئەو دەرەنجامە کە بە دەگمەن و لەهەر سەد کەس یەکێک بایی ئەوەیە قسە و مناقەشەی لەگەڵ بکەی لێگەڕێ هەرچی خەڵکی دیکە هەرچی حەزیان لێیە بیڵێن چونکە هەموو کەس ئازادە دەبەنگ بێ.

ڤۆڵتێرت بەبیردێ دەڵێ: سوڵح و ئارامی لەڕاستی باشترە هەروەها ئەو پەندە عەرەبیە بهێنەوە خەیاڵت کە دەڵێ: «بێدەنگی تاڵە، بەری شیرینە!».

# پاشکۆی «۱»

پێشینان لۆژیک (logic) و دیالەکتیک (dialectic) یان وەک دوو وشەی هاو مانا داناوە.

ئەگەر (logizesthai) بەمانــــای بیرکـــردنەوە، لێکــۆڵینەوە، لێپێچیـــنەوە و (dialegesthai) بەمانــای گفتوگــۆ، کەواتە دوو شتی تەواو لێک جیاوازن.

بەوشـێوەیە کە دیـوگنس لایرتیـوس[١٣] دەڵێـت: بـۆ یەکەمینجـار ئەفلاتوون وشەی دیالەکتیکی باکارهێناو لە فایدروس[١٤]، سوفیست[١٥]، کۆمار[١٦]، کتێبی حەوتەم و زۆر شوێنی دیکەش، دەبینن کە مەبەستی ئەو لە دیالەکتیک بەکـاربردنی سـنووری عەقـڵ و لێوەشـاوەییە لە بەگەڕخستنی لەکاتی پێویستدا.

بەهەمان شێوە ئەرستۆ بۆ هەمان مەبەست بەکاری هێنـاوە بەڵام بەگوتەی لورنتیۆس ڤالا[١٧] ئەرسـتۆ یەکەمـین کەس بـووە کە لـۆژیکی

---

١٣- Diogenes Laertius

١٤- Phaedrus

١٥- Sophist

١٦- Republic

١٧- Laurentius Valla

بەهەمان مەبەست بەکار هێنـاوە، لەبەر ئەوە وا پێـدەچێ کە وشـەی دیالەکتیک لەوشەی لۆژیک کۆنتربێ.

سیسـرۆن[١٨] و کۆینتلیـان[١٩] ئەو دوو وشـەیان لەمانا گشـتییەکەدا بەیەک شـت بەکارهێنـاوە، بەکارهێنـانی ئەو دوو وشـەیە وەک دوو وشەی هاومانا لەسـەدەکانی ناوەڕاسـت و سـەردەمی مـۆدێرن و تـاکو ئێستاش درێژەی هەیە.

بەڵام لەسەردەمانی کـۆن و بەتـایبەت لەلایەن (کانـت)ەوە زیـاتر دیالەکتیک بەمانای (بەد، دزێو و ناشـیرین) واتـا بەمانـای (هـونەری موناقەشەی سەفسەتە ئامێز) بەکار براوە.

لەبەر ئەوە لۆژیـک وەک دەسـتەواژەیەکی جـوانتر و ڕووسـوورتر ئەژمێـردراوە، سـەرەڕای ئەوەش لە بنەڕەتـدا هەردووکیـان مانـایەکی وەک یەکیـان هەیە و لەو چەندسـاڵەی دوایشـدا دیسـان بە هاومانـا دانرانەوە.

---

١٨- Cicero

١٩- Quintilian

# پاشکۆی «٢»

مایەی نیگەرانییە کە ئەو وشانە لەسەردەمی کۆندا بەو مانایانە لێک دراونەتەوە منیش رێگە پێدراو نیم کە مانای هەرکامیان لەیەکدی هەڵاوێرم، بەدەر لەو حاڵەتە وام پێباشبوو (logic)ی وەرگێڕاو لە (logos)و بەمانای «وشە» و «عەقڵ» کە لەیەکدی جیا ناکرێنەوە بەشێوەی «زانستی یاساگەلی ئاوەز، واتا زانستی شێوازی عەقڵ پێناسە بکەین.

لەو حاڵەتەدا (dialectic) وەرگیرا و لە (dialegesthai) و بەمانای گفتوگۆ- هەرگفتوگۆیەک یان سەبارەت بە ئەمری واقیعە یان لەسەر باوەڕ و ئیمانەکان بێت، بە واتایەکی دیکە (یان مێژوویییە یان هەنووکەیی) وەک (هونەری قسەکردن) بەمانای مۆدێرنی وشە پێناسە بکەین کەواتا دیارە لۆژیک پەیوەندی بە بابەتێکەوە هەیە کە خەسڵەتی تەواو لەمێژینەی هەبێ و بەپێی پێناسەکە لە ئەزموون بەدەرە.

واتا یاساگەلی بیرکردنەوە شێوەی ئاوەز یان لۆگۆس، مەبەستم یاساگەلێکە کە عەقڵ پەیڕەویان لێدەکات.

کاتێ بەحاڵی خۆیەوە بەجێ بهێڵرێ و بەری لێنەگیرێ وەک بیرکردنەوەی تاک لایەنە بوونەوەرێکی عاقڵ کە بەهیچ شێوەیەک گومڕا نابێ.

لەبەرامبەردا دیالەکتیک لەڕووی هاموشۆی دوو بوونەوەری ژیر لەبەر ئەوەی ژیرن دەبێ هاوبەشی فکرییان هەبێ، بەڵام کاتێ وەک دوو سەعات ڕێک لەیەک کاتدا کاتی دیاریکرا و جیاواز نیشان دەدەن، دەستدەکەن بە باس و گفتوگۆیان ڕووبەڕووبوونەوەی فکری.

بە باوەڕی من ئەگەر ئەو دوو کەسە بە دوو بوونەوەری ژیر بژمێررین دەبێ ئەو دوانە بەیەکەوە ڕێک کەوتبن، جیاوازییان دەرەنجامی جیاوازی ئەو بۆچوونانەیە کە بەشێکی زاتی فەردیەتی مرۆڤ دەژمێرێ بەواتایەکی دیکە ئەو جیاوازییە لە ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێ.

لەبەر ئەوە دەبێ بتوانی لۆژیک وەک زانستی بیرکردنەوە یان شێوازی دەرخستنی هۆشێکی پڕ، دامەزراندبێ.

دیالەکتیک بەشێوەی ئاسایی تەنیا دەتوانین بەپاشکۆ بژمێرین، واتا پێگەکەی لە ڕێگەی ناسینی ئەزموونی تێکچوونی بەرفراوانی فکری نایاب فێردەبین.

تێکچوونێک کە لە جیاوازی کەسێتی لەهاتوچۆی نێوان دوو کەسدا سەرهەڵدەدا سەرەڕای ئەوەی کە هەر لەسەرەتاوە لە فێربوونی ئەو بابەتەدا هاوکاریمان دەکا ئاشنا بوونە بەو شێوازانە کە هەردوو لایەنی بابەتەکە بۆ سەلماندنی ڕاستی گەنگەشەکەیان نیشانیاندا بێ وێنە و ئاشکرا بوونی هەنگاو دەنێین، چونکە پۆلێن بەندی بەشەری جۆرێکە کە ئەگەر (ا) و (ب) بەیەکەوە یەکگرتنەوە و هاوسەنگی فکرییان هەبێ و لەسەر بابەتێک بکەونە ڕاوێژ و

ڕاگۆڕینەوە مادام کە ڕوداوێکی مێژوویی ڕەها لەگۆڕێ نەبێ، (ا) بۆی دەربکەوێ کە (ب) ڕای پێچەوانە و سەربەخۆی خۆی هەیە. دەست ناکا بە پێداچونەوەی ڕاو بیر و قسەکانی خۆی و پەی بە هەڵە زەقەکانی خۆی نابات، بەڵکو پەی بەوە دەبات و پێی وادەبێ کە لەجۆری بیرکردنەی (ب)دا کەموکووڕییەک هەیە.

بەواتایەکی دیکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی پێداگر و عینادە و ئەو تایبەتمەندیەش دەرەنجامی دیاریکراوی هەیە کە بە لقێکی زانستدا لێیان کۆڵیوەتەوە من حەز دەکەم ئەوە بە دیالەکتیک یان دیالۆگ لێک بدەمەوە.

بەڵام بۆ خۆدەرباز کردن لە خراپ تێگەیشتن ئەوە بەدیالۆگێکی مناقەشەئامێز یان (مراء) ناو دەنێین.

بەو شێوەیە ئەو لقە لەزانست باس لە پێداگری و سەرەڕۆیی فکری سروشتی مرۆڤ دەکات.

# پاشکۆی «٣»

پێش هەموو شتێک دەبێ سەیری ماهیەتی سەرەکی هەر بابەتێک بکەیت و بزانی ئەو بابەتەی لەخۆی گرتووە بەڕاستی چییە؟ دژبەری ئێمە کێشەیەکی خستۆتە ڕوو (یاخود ئێمە خستوومانەتە ڕوو) دوو شێوە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەوەلەگۆڕێیە و دەتوانین دوو ڕێگە بەکار بێنین:

«١»

ئەو دوو شێوازە بریتین لە:

١- دەتوانین نیشانیبدەین کە ئەو کێشەیە لەگەڵ هەقیقەتی عەینی (adrem) هاوسەنگ نییە.

٢- ئەوە کە لەگەڵ قسەگەلی دیکەی دژبەرەکەمان، بۆ نموونە وەک ئەوەش دەکەوێتە بەرچاوی کە هەقیقەتی تێدا نییە. (adnomiem)

جۆری دووهەم هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ حاڵی هەقیقەتی عەینی دا نییە.

«٢»

ئەو دوو ڕێگەی کە دەتوانین پێیدا بڕۆین بریتین لە:

١- بەرپەچدانەوەی ڕێک و ڕوون و ڕاشکاو

٢- بەرپەرچدانەوەی بە ئاماژە (هێما)

لە بەرپەرچــــدانەوەی ڕاشـــکاو بە بەڵـــگەی ڕوون و ڕەوان بەرپەرچـدانەوەی ئامـاژە و هێمـا هێـرش دەبـاتە سـەر دەرەنجـامی ئەوەیان.

بەرپەرچدانەوەی ڕاشکاو نیشانی دەدا کە تێبینی یەکەم ڕاستییە بەرپەرچدانەوەی بە هێمـا پێشـانی دا کە نـاتوانی تێبینـیـیەکە ڕاست بێ. ڕەتکردنەوەی ڕاشکا و دوو لایەنی هەیە: یـان دەتـوانی نیشـانی بدەی کە بەڵگەکانی ناو قسـەکە درۆن یـان دەتـوانین پێشـەکییەکەی قبووڵ بکەین بەڵام وانیشان بدەین کە ئەو قسەیە دەرەنجـامی ئەوانە نییە واتا هێرشی بەرینە سەر دەرەنجام.

بەرپەرچدانەوەی ڕاشکاو لە بەلاڕێدابردنی بابەتەکە یان نمـوونەی پێچەوانە کەڵک وەردەگرێ.

«A» بەلاڕێدابردنی بـاس: ئـێمە دان بە ڕاسـتی بـابەتی دژبەری خۆمانـدا دەنێـین دوایـی وا دەردەخەیـن کە لە پەیوەسـتکردنی ئەو کێشـــەیە بە کێشـــەیەکی دیـــکەوە کە ددانمـــان بەڕاســـتیدا نـــاوە بەشێوەیەکی ڕەها چ دەرەنجامێک بەدەست بێ، ئەو دوو بابەتە وەک پێشـەکی دەرەنجـامی ئاشـکرا (درۆ) یـان پێشـەکی دیـکە قسـەکانی خودی دژبەر بەکار دێنین.

«B» نمـــوونەی پـــێچەوانە و دژ: نمـــوونەی دژ بـــریتییە لە ڕەتکردنەوەی کێشەی گشتی ـ گەڕانەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی تـایبەت بەمانەیە، بەڵام لەبنەڕەتدا لەبارەی ئەوانەوە ڕاستی تێدا نییە!

چوارچێوە یان پەیکەری تەواوی شێوازەکانی باسەکە ئاوایە.

چونکە لەکۆتادا دەتوانی هەرجۆرە باسێک بەوە پەیوەست بکەی سەرەڕای ئەوە ئەو هەموو باسە لەوانەیە بەڕاستی بەشێوەیەک وەسفکراو بچێتە پێشەوە یان تەنیا لە ڕواڵەتدا وابێ و لەوانەشە پشتگیری لە بەڵگە ڕاستەکان یان ناڕاستەکان بکا. بابەتی ئێمە تەنیا بەو هۆکارە تا ئەو ئەندازەیە درێژ و سەرسەختانەیە کە بە ئاسانی ناتوانی بگەیتە هەقیقەتی بابەتەکە.

لەخستنەڕووی بەڵگەدا ناتوانین ڕاستی واقیعی لە ڕاستی ڕواڵەتی جیا بکەینەوە، تەنانەت دوو کەسی خاوەنی باسەکەش بۆ خۆیان لەو ڕووەوە تەواو دڵنیا نین، بەو پێیە من تەڵەکەی جۆراوجۆر بەبێ لەبەرچاوگرتنی بابەتی تایبەت بەڕاستی یان درۆی بەرچاو لێک دەدەمەوە، کەواتا سەبارەت بەو بابەتە هیچ دڵنیانین و ناشتوانین ئەوەیان بەتەواوی لێک جیا بکەینەوە.

سەرەڕای ئەوەش لەهەر باس یان بەڵگەیەکدا و سەبارەت هەرکێشەیەک دەبێ ڕێک بکەوین، وەک بنەمایەک دەبێ بخوازین لەبابەت کێشەی بەرچاو دادوەری بکەین و ناتوانین گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کەسانە بکەین کە ئینکاری بنەما دەکەن.

# کۆتایی:

# «ڕەشبینی شۆپنهاوەر»

**ئەی. سی. گریلینگ**

تایبەتمەندی ڕەشبینانەی تێڕوانینی شۆپنهاوەر بەرانبەر بە سرووشتی مرۆڤ نموونەی ڕەشبینی سەرجەم فەلسەفەی ئەوە. هەروەک دەزانین (کانت) واقیعیەتی ئاشکرای[20] لە واقیعیەتی نائاشکرا[21] جیا کردۆتەوە.

یەکەمیان بریتییە لە واقیعیەت بەشێوەیەک کە ئێمە ئەزموونمان کردووە، دووهەمیان بریتییە لە واقیعیەت بەشێوەیەک لەخۆیەوە بوونی هەیە. بە باوەڕی شۆپنهاوەر کانت بەهەڵەدا چووە کە دووەمیانی تەواو نابەردەست ئەژمارکردووە، چونکە ئێمە بەو جۆرە ئیرادەی خود ـ خواستی خود ـ کە واقیعیەتی وجودی خۆمانە و بە گوتەی شۆپنهاوەر بە ڕاگەیاندنی ئەو بابەتە دەتوانین بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئیرادە گەوهەری دەروونی هەموو واقیعیەتێکە.

لەبەرئەوەی ئیرادە هێزێکی ناعەقڵانی و پڕ کۆششە کە کوێرانە بێ هیچ مەبەست و ئامانجێک کاردەکات، دەگەینە ئەو دەرەنجامەی گەنگەشەی هیگڵ لەمەڕ ئەوە کە «واقیعی عەقڵانییە» ڕاست نییە.

---

[20] - Phenomenal

[21] - Noumenal

هەروەها بۆمان دەردەکەوێ ئەگەر ژیان لە سەر بنەمای دەرد و ڕەنج بنیاد نرابێ ئەو بۆچوونە جگە لە گیرۆدەبوون لەدەستی هەوڵە کوێرانەکانی ئیرادە شتێکی دیکە نییە.

واتا هەمان چەمکی دیار و دانپێدانراوە و ئەخلاقیاتی ئوپانیشا دەکات و دەقە بوداییەکان کە شۆپنهاوەر بەگەرمی کەوتبۆ ژێر کاریگەریانەوە، بە باوەڕی شۆپنهاوەر ئەو بابەتە هەقیقەتێکی ژیانە تەنیا کاتێ لەو دەرد و ڕەنجە ڕزگاربوون دەبێ کە ئیرادە «بگەڕێتەوە و خۆی ئینکار بکات» واتا لە ڕێگەی پچڕاندنی خواست و ئارەزوو برینی زنجیرەی پەیوەستکردنی بەشتی ئاشکرا. دەرەنجامێکی لاوەکی ئەو دیدگایە هەروەک ڕای نەرێنی شۆپنهاوەر سەبارەت بە سرووشتی مرۆڤایەتییە.

ئەو تەواو دژی ئەو بۆچوونە بوو کە پێیوابوو ڕەوشتی مرۆڤ دەبێ لەسەر بنەمای ئایدیای کەرامەتی مرۆڤ وەک بنەمای حاکم بەسەر ڕەفتاری ڕێزدارانە و بە ئەدەبانەی خەڵکی بەیەکەوە بنیات بنرێ، بە پێچەوانەوە هەرمرۆڤێک ئاوایە کە «خراپی و بەدی ئیرادەی سنوورداربوونی هێزی ئاوەزی شەڕانگێزیەکانی بیر و باوەڕی دەبێ ئێمە والێبکا کە نەفرەتی لێ بکەین

هەمان هۆکارگەلێکن کە وا لە خەڵکی دەکەن لەجیاتی ئەوەی بەدوای ڕاستی و هەقیقەت دا بگەڕێن، بەردەوام بەدوای سەرکەوتندا دەگەڕێن. لەبەر ئەوەی شۆپنهاوەر دەڵێ: ئامادە و لەسەرهەست بە و بەهەمان شێوە ڕەفتاربکە کە سەرکەوتوودەبی.

## «یاداشتی وەرگێڕی ئینگلیزی»

ئەوکتێبەی ئێستا لەبەردەستتاندایە نووسینێکی درەنگ گەیشتووی یەکێکە لەو کۆمەڵە بەرهەمە کەمبایەخانەی شۆپنهاوەرە کە هەوڵمداوە بەشێوەیەکی گونجاو بیخەمە بەر چاوی خوێنەرانی بەرێز.

تەواوی سەرە بابەتەکانی ئەو کتێبە بریتیین لەکۆی نووسینەکانی کە لەدوای مردنی شۆپنهاوەر بەچاپ گەیەنراون.

بەشێکیان دوای سێ یان چوار ساڵ لەدوای مردنی لەلایەن واریسی ئەدەبی ئەو، (یولیۆس فراوینشتین) بڵاوکرانەوە و دونیا لەهەبوونیان ئاگادارکرا..

هەرچەندە کە ئەو خزمەتە گەورەیەی (فراوینشتین) لەوەی کە دەبوو، نەدەبوو قسەی زۆری لەسەر نەکراوە.

لەو دوایانەدا دکتۆر گریزباخ دووبارە ئەو نووسینانەی، بەلێزیادکردن و شیکاری تەواوە بڵاو کردەوە.

سەرەنجی ئەو لەخوێندنەوەی ئەو دەستنووسانە کە بەشێکیان لەکتێبخانەی پاشایەتی بەرلین پارێزراون، سەرەنجەکانی لەسەر ئێمەشی ئەگەرچی بەشێوەیەکی زۆر سەختگیرانەیە پەنجەی خستۆتە سەرهەندێ لە هەڵەگەل و کەموکورتیەکان، وێڕاستارییەکەی شایەنی رێزە.

ئێستا تەواوی نووسینەکانی شۆپنهاوەر لە دوو تویێی چەند کتێبێکدا بەناوی کۆبەرهەم لەریزی باشترینی کتێبەکانە و چ بەزمانی ئەڵمانی و چ بەزمانەکانی دیکە وەرگێڕرابن لەتەواوی کتێبخانەکانی ئەڵمانیا و پێشەنگەکاندا دانراون، دەکرڕێن.

ئەو ڕاستییە بەئەندازەی پێویست ئەوە دەردەخا کە شۆپنهاوەر لەوەلاتی خۆی و نێو خەڵکی خۆیدا زۆر بەڕێز و خۆشەویستە.

ڕێژەی داواکاری زۆری وەرگێرانی بەرهەمەکانی بۆسەر زمانەکانی دیکە نیشانەی ئەوەیە کە لەجیهان و بەدەر لە ئەڵمانیا ناوبانگێکی زۆری هەیە.

ئەو پێشوازییە گەرمەی کە وێراستاری تازەی نووسینەکانی لەدوای مردنی بڵاو کرایەوە منی بۆ ئەوە هاندا کە پێنج ساڵ پێشتر کۆتایم بەوەرگێڕانی هەندێکی هێناوە و ئێستە دەمەوێ کتێبێکی دیکەی بڵاو بکەمەوە کە هەڵبژاردەیەکە لەو تەڵەکە و هونەرانەی کە زۆر بەجوانی نووسیونی و خستوونیەتەڕوو.

بەشێکی بچووکی لێکۆڵینەوەی هونەری مشتومڕ لەسەردەمی ژیانی شۆپنهاوەر لەبەشێکی هونەرنەمایی لەژێر ناونیشانی سەبارەت بە (لۆژیک و دیالەکتیک) بڵاو کرایەوە. خوێنەری بیرتیژ بۆی دەردەکەوێ کەبەشی زۆری بابەتەکانی ناو دووتویێی ئەو کتێبە تایبەتمەندی تەنز و توانج ئامێزی هەیەو پڕیەتی لە تانە و تەشەر.

سەبارەت بە سێ بابەتی کۆتاییش دەبێ بڵێم: ئەو دەستەواژانەی کە کەمبایەخ یان پووچ دێنە بەرچاو سڕیومنەوە

هەروەها ددانی پێدادەنێم لەیەک دوو شوێندا سەردێڕ و ناونیشانم بەشـــێوەیەک بەدڵـــی خـــۆم وەرگێـــڕاوە کە زیـــاتر دەلالەت لە ناوەڕۆکەکەی بکات.

لەلایەکـانی دیـــکەوە تەواو پابەنـدیم بەدەقـــی ســـەرەکییەوە هەبـووە و ئامـانجم ئەوەبـوو کە وەرگێـڕانەکەی مـن زۆر لە دەقە سەرەکیەکەوە نزیک بێ.

«تی — بیلی ساندرز»

# لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی فێربوون

| | |
|---|---|
| فێربوونی ئینگلیزی کوردی/سام رەند | ئا: صابیری رەحیمی |
| فەرهەنگی قانونی | محمد وەسمان |
| فەرهەنگی ئۆکسفۆردی E- کوردی | هودا عبدالله علي |
| خۆم نا دڵم وا ئەڵێ | نەبەز گۆران |
| نامەکان | نەبەز گۆران |
| مانگەشەو/ شیعر | نەبەز گۆران |
| مانگەشەو/ رۆمان | نەبەز گۆران |
| شیعرەکانی نزار قەبانی/غادەسەمان | نەبەز گۆران |
| دێوانەیەك لەم شارە/ رۆمان | نەبەز گۆران |
| ماڵی یار/ سوهراب | توانا ئەمین |
| دژە مەسح/ فریدریك نیچە | و/ رێبین رەسول ئیسماعیل |
| ئەوەیە مرۆڤ/ فریدریك نیچە | و/ رێبین رەسول ئیسماعیل |
| ئاوابوونی بتەکان/ فریدریك نیچە | و/ رێبین رەسول ئیسماعیل |
| دەرمانخانەی ئەفلاتۆن/ جاك دریك | و/ رێبین رەسول ئیسماعیل |
| رینی دیکارت/سێ تێکستی فەلسەفە | و/ د.حەمید عەزیز |
| گوێرەکە/ مۆیان | و/ ئاری هاشم |
| دیدەنی کچێکی سەدلەسەد دڵخواز/ هاروکی مۆراکامی | و/ ئاری هاشم |
| مێرەی دەرسیم | عەزیز مەلا رەش |
| فەرهەنگی قانوونی | محمد وەسمان |
| خەمۆکی/ لویس ولبرت | و/ کەمال فاروق نەسرەدین |
| سایکۆلۆژیای منداڵ | کەمال فاروق نەسرەدین |
| زانستی سزا/ محمد شلال | و/ کاوانی ئەنوەر مەسیفی |
| فەلسەفەی مردن/ ك.ل عەبدوك | و/ ئارام ئەمین شوانی |